حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# پەروەردەیا ئیسلامی

## بۆ پۆلا یازدێ ئامادەیی

**بەرهەڤکرنا**

لیژنەیەکێ ل وەزارەتا پەروەردەیێ

**هەڵسەنگاندنا زانستی**

ئەبوبەکر عەلی کاروانی
د. بەشیر خەلیل تۆفیق

**هاتییە کرما نجیکرن ژلایێ**

ئیسماعیل تاها شاهین
تەحسین ئیبراهیم دۆسکی
خواجة طه شاهین

**پێداچوونا زانستی**

عبدالجبار محمد شریف

**پێداچوونا زمانی**

خواجة طه شاهین

چاپا سێیێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# پێشگۆتن

مامۆستا و قوتابیێن خوەشڤی، کتێبا ل بەر دەستێن هەوە، پرۆگرامێ بڕیار پێ داییێ بابەتێ (پەروەردەیا ئیسلامی و ئایینناسی)یە، بۆ پۆلا یازدە یا ئامادەیی و قۆناغا دویێ یا خواندنا پیشەیی و پەیمانگەهان، ئەڤ پرۆگرامە، د وارێ گۆتنا ڤی بابەتیدا، وەك پێگاڤەکا مەزن دئێتە هەژمارتن، کو ژ بەرێ وەزارەتا پەروەردەیا حکوومەتا هەرێما کوردستانێڤە هاتییە ئاڤێتن، چونکی ئەڤە گەلەك سال بوون، ئەڤ بابەتە د بن بارێ پرۆگرامەکی کلاسیکییێ کەڤندا بوو، کو نەدشیا ئارمانجا گۆتنا ڤی بابەتی بهنگێڤت، ژ بەر هندێ، پشتی ئەنجامدانا گەلەك ڤەکۆلانێن مەیدانی ژ بەرێ پسپۆرێن ڤی بابەتیڤە، وەزارەتا پەروەردەیا حکوومەتا هەرێما کوردستانێ، ب پێدڤی دیت، کو پرۆگرامەکی نوو بۆ ڤی بابەتی بێتە دارێتن، د گەل پێشکەڤتنا جڤاکی بگونجت و ڕێنیشاندەر و ڕێبەر بت بۆ قوتابیێن مە یێن خوەشڤی، دا پێ ڕاستییا دینێ خوە یێ پیرۆز ناس بکەن.

ب خواندن و ڤەخواندنا بابەتان، ڕۆن و ئاشکەرا دبت، کو بابەت ب شێوازەکی هەڤچەرخ هاتینە بەرهەڤکرن و ل بەر دگەڕن چاڤەکی ڤەکری و ڕۆن و بێ گرێ بۆ قوتابییان دورست بکەن و وان بپارێزن ژ تێنەگەهشتنا نەڕاست و ب کێماسی د دەرهەقێ ئیسلامێدا، وەك دینێ باراپتر ژ خەلکێ جڤاکا مە.

هەر وەسا ژ بۆ بەرچاڤکرنا بابەتان ژی، ڕێکا نووژەنکرنێ ژی هاتییە گرتن، و ل دووماهییا هەر بابەتەکێ ژی، کۆمەکا پێشنیار و دان و ستاندن و پسیاران هاتینە هلێخستن، دا قوتابی پشکدارییێ د دەولەمەندکرنا وانەیاندا بکەن، و ب تنێ وەك ئەرکەکی قوتابخانەیا خوە نەچنە د پۆلاندا، بەلکو مەرەما وان مفا وەرگرتن و پەروەردەبوون و بلندکرنا ئاستێ هشیارییێ بت. ئەم پشتڕاستین کو ئەڤ پرۆگرامە، دێ بتە ئێك ژ پرۆگرامێن پێشکەڤتی، نە ب تنێ ل عیراقێ، بەلکو ل ڕۆژهلاتا ناڤین ژی، و ڕۆلێ وی، د ڕاستا بلندکرنا ناڤ و دەنگێ هەرێمێدا، د پێشڤەبرنا سەمتا هزر و بیرا چاکسازیدا، د ئاخ و کاخا هزرا ئیسلامی و پرۆگرامێ ئایینیدا، د ناڤەندێن خواندنێدا، دێ گەلەك بت.. هیڤیدارین مامۆستا ژی، وەسا بەرێ خوە بدەنە ڤی بابەتی، کو ڕۆلەکی مەزن هەیە، د پەروەردەکرن و پارستنا پێناسەیا بابکێن نوو و ڤەکرنا ئاسۆیەکی نوو د سینگێ واندا، و هەر د ڤی وار و دەراڤیدا، مامۆستا ب گرنگی و

پووتەپێکرن بابەتێن ڤی پرۆگرامی بدەنە قوتابییان، و ب دلسۆزی بارێ ل سەر ملێ خوە ڕابکەن.. و مە پێ خوەشە، ڤان چەند خالان ژی، وەك ڕێنیشادان و هێسانکاری، دانیینە بەر چاڤێن مامۆستاییێن خوە یێن هێژا و ڕێزدار:

١- پشککرنا بابەتان بۆ چەند وانەیان، تنێ بۆ بارسڤکاتییا مامۆستایانە، گەلەك ئاساییە، دەمێ گۆتن و تەمامکرنا بابەتی، سینۆرێن ڤێ پشککرنێ بێنە شکاندن.

٢- مامۆستا بۆ هەر وانەیەکا نوو، بەری هەر تشتەکێ داخوازێ ژ قوتابییان بکەت کو وەك ئەرك خوە بۆ بەرهەڤ بکەن، و ژ ڕێڤە د پۆلێدا، ب ڕێکا هندەك پسیاران، پشکدارییێ د گۆتنا وانەیێدا بکەن، و پاشێ ژ نوو مامۆستا وانەیێ شرۆڤە بکەت.

٣- مەرەم ژ نەهێلانا ژ بەرکرنێ، دوورخستنا قوتابییە ژ تەلقین و بێزارییێ، ژ بەر هندێ، نابت د ئەزموونانندا پسیارێن ب زەحمەت و گران بێنە ئینان و قوتابی پێ بێتە ترساندن، چونکی مەخسەد ژ ڤێ وانەیێ پەروەردەکرنا قوتابییە، نە ترساندنا وی.. لەو باشترە پسیارێن ئەزموونان ژ ڤان جوونان بن: خەلەت و ڕاست و ڕاستکرن و هلبژارتنا بەرسڤا ڕاست..

٤- سروشتێ بابەتان وەسا دخوازت، کو مامۆستا باش خوە بۆ بەرهەڤ بکەن، و مە گومان نینە، کو ئەو ژی ڤێ یەکێ ب خەم وەردگرن.

٥- هیڤیدارین کو ڕێڤەبەرێن قوتابخانەیان، بۆ گۆتنا ڤی بابەتی، و ب ڕێکا دەستنیشانکرنا مامۆستایێ پسپۆر و خودان شیان، خەمسارییێ نەکەن، چونکی سیاسەتا نوویا پەروەردەیی یا حکوومەتا هەرێمێ، پووتەدانە ب پەروەردەکرنا بەرەبابکێن ڤێ هەرێمێ.

٦- پێدڤییە مامۆستا گرنگییێ بدەنە وان پسیار و دان و ستاندنێن ل دووماهییا هەر وانەیەکێ هاتینە دانان، ب مەرەما هاندان و لڤاندنا مەژییێ قوتابییان و ڕەهوانکرنا وان ل سەر هزرکرن و دان و ستاندن و شرۆڤەکرنێ، کو بێگومان د ڤی کاریدا، دێ د بابەتێن دی یێن خواندنێدا مفادار ببن.

خودێ هاریکارێ مە هەمییان بت

سەرپەرشتیارێ زانستی

## وانەیا ئێکێ

## باوەرناسی

### باوەر (ئیمان):

باوەر یان ژی (ئیمان)، ڕاستی و هەستەکە د دلیدا هاتییە ڕسیان و شۆپا وێ د گۆتن و کریارێن مرۆڤێ باوەرداردا دەردکەڤت. باوەر مەرجێ وەرگرتنا کریارا ڤەنجە و کلیلێ ڤەکرنا دەرگەهێ بەهەشتێیە.

پەیڤا (ئیمان = باوەر) د زمانێ عەرەبیدا ژ ژێدەرێ (أمن) هاتییە کو ئیشارەتە بۆ وێ ئارامی و ئێمنی و تەناهیا دەروونی ئەوا مرۆڤ د بن سیبەرا باوەرێدا هەست پێ دکەت و پشکدارییێ د بەختیارییێدا دکەت. خوەجهیا دەروونی بۆ مرۆڤی دابین دکەت و ترس و خودووك و دودلییێ ژێ دوور دئێخت و بەرێ وی ددەتە کنارێ تەناهی و بەختەوەرییێ. پەیڤا (مؤمن = باوەردار) ژی، د پشکەك ژ ڕامانا خوەدا ئیشارەتە بۆ هندێ کو باوەردار پشتی ئەو ب خوە دگەهتە تەناهیا دەروونی، ئەو ژی ژ بەرێ خوەڤە پێکۆلێ دکەت کو خەلکێ دی ژی، ژ ڤێ کەرەم و خوەشییێ بێبار نەبن. هەر وەسا د ژیانێدا، باوەردار کەسەکە تەناهی و خێر و خوەشی بۆ کەسێن دی و جڤاکێ ژی دڤێت، نە بەس بۆ خوە ب تنێ.

ل گۆڕ دیتنا ئیسلامێ ژی باوەر (ئیمان) ژ بڕیارا ئازادا مرۆڤی دەردکەڤت و ب دارێ زۆرێ نائێتە سەپاندن (فەرزکرن)، هەر وەکی خودایێ مەزن دبێژت: (( **لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ...** )) (البقرە ٢٥٦).

ئانکو: کۆتەکی و زۆرلێکرن د دینیدا نینە. هەر کەس دڤێت ب دلێ خوە ڕێکا باوەر و باوەرداری و خودێناسییێ هلبژێرت. چونکی ئەگەر زانست و زانیاری ب تنێ ناسکرنا تشتان بت، باوەر ژ بلی ناسکرنێ -کو دیارە گەلەك گرنگە، چونکی موکومترین و کوورترین باوەر ژ ناسکرنەکا کوور پەیدا دبت -پێدڤی ب ڤیانا وی کەسییە، بۆ وی تشتێ وی باوەری پێ ئینایی، ژ بەر هندێ دڤێت ژ بلی ناسکرنێ، دوو بنەمایێن دی ژی د هەڤبەندیيا باوەرئینانێدە هەبن، ئەو ژی ئەڤنە:

١- ڤیان.

٢- پشتپێگرێدان.

ب ڤی ئاوایی باوەردارێ ڕاستانی و دورست، نە بەس باوەرەکا هشکا عەقلی ب خودێ هەیە، بەلکو خودایێ مەزن ل بەر ڕۆناهیا ناڤ و سالۆخەتێن وی و ب وی ئاوایێ خودێ ب خوە، خوە پێ داییە ناسین، ناس دکەت. هەست ب مەزناتی و دلۆڤانی و دان و کەرەمێن وی دکەت و هەوارا خوە دگەهینتێ و دکەتە جهێ ڕاز و نیاز و مەرەمێن خوە. هەر وەسا خودایێ مەزن دبێژت: (( **إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴿٢﴾ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴿٣﴾ أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴿٤﴾** )) (الانفال ٢ - ٤).

ئانكو: باوەردارێن ڕاست و دورست، ئەو کەسن، ئەوێن دەمێ خودێ دئێتە سەر هزرێ و ناڤێ وی دئێتە ئینان، دلێ وان دقوتت و نازك دبت، و دەمێ نیشان و ئایەتێن خودێ ل سەر وان دئێنە خواندن، باوەرییا وان موکومتر لێ دئێت و پشتا خوە ب خودایێ خوە گرێ ددەن، ئەوێن نڤێژان بەردەوام دکەن و بارا خودێ ژ زەکاتا مالێ خوە ددەن. ب ڕاستی ئەڤەنە باوەردارێن ڕاستانی و دورست.. ئەڤان ل دەڤ خودایێ خوە، پایە و پەیسکەکا بلند و لێبۆرین و ڕزقەکی زاف و بێمنەت هەیە.

ژ بۆ کو مرۆڤ ژی بگەهتە ڤی ئاستی، کو تام و مفایی ژ باوەر و بەرهەمێن وێ یێن شرین وەربگرت، دڤێت باوەرا وی بەرئەنجامێ خودێناسینێ بت و ژ دەرگەهێ ڤیانێ بچتە ناڤ باغێ باوەر و تێگەهشتنەکا ڕاست و دورست دەرهەقی دینێ خودایێ مەزن، و دڤێت ڕێکێن گەهشتنا خودێ و ب دەستڤەئینانا لێبۆرین و هاریکارییا وی بگرت.

ژ ئایەتێ ئاشکەرا دبت، کو باوەرا خودان ناڤەرۆك و ڕاستانی، گەرمەکێ د دل و دەروونێ باوەردارێدا دچینت و شین دکەت، پێ بەرانبەری خودایێ مەزن و ئایەتێن وی هەستیار دبت و ئایەتێن خودێ تێکلی دەمارێن لەشێ وی دبن و دبتە ئەگەرێ موکومبوونا باوەرێ و زێدەتر نێزیکبوونا مرۆڤی ژ خودێ، و هەستکرن ب تەناهی و سەربلندییێ ژی.

هەر وەسا ڕۆن دکەت، کو ئێك ژ بەرهەمێن باوەرێ و نیشانەك ل سەر کووری و ناڤەرۆکدارییا وێ، جهئینان و کرنا نڤێژانە ب گەرمی، چونکی ئایەت بەحسێ کرنا نڤێژێ دکەت کو ڕامانا شۆڕشەکا ڕووحی ل سەر دئێتە گرتن و دان. هەر وەسا وە ل مرۆڤی دکەت، کو فێری لێنەگرتن و لێبۆرینێ ببت و هەڤسۆزییێ د گەل غەیری خوە دەربێخت و نە تنێ ل بەر یا خوە بت و بەس بۆ خوە بژیت.

د قورئانێدا دەمێ بەحسێ باوەرێ دئێتە کرن، بارا پتر بەحسێ کریارا باش ژی دکەڤتە دوو. ئانکو قورئان ب ئاوایەکی گشتی، بەحسێ باوەرداریێ ڤەنجیکار دکەت، ئەڤە ژی وێ پەیوەندییا موکوم، ئەوا د ناڤبەرا باوەرێ و کار و ڕەفتارێ ڤەنجێ مرۆڤی دیار دکەت، و پەسەند دکەت کو باوەردار و و ڤەنجیخوازی و ڕەوشتپاکی، تێك هلکێشاییینە و ب سانەهی ژ ئێکدو نائێنە جوداکرن، چونکی باوەرداری باوەری ب ژیان و جیهانەکا دی هەیە کو ئەو تێدا دێ زێندی بت، و ل وێرێ، ل سەر ژیانا ڤێ جیهانێ، پسیار دێ ژێ ئێتە کرن، و ئەزموونا وی ژی، دێ ل سەر ئەنجامدانا کارێ باش و ڤەنجیخوازییێ بت، هەر وەسا (باوەر) سەرۆکانی و ژێدەرێ گەلەك هەست و سۆزێن پاکە و ئەڤ هەستە ژی مرۆڤی پال ددەنە ڤەنجیخوازییێ، و ڤەنجیکرنێ دکەنە پشکەکا جودانەکری ژ کەساتییا مرۆڤێ باوەردار.

د ئایەتەکا دیدا، دوبارە خودایێ مەزن، باوەرێ ب ڕەوشەکا دەروونییا دیارکری و هندەك ڕەفتارانڤە گرێ ددەت، کو ل مرۆڤی دیار دبن، هەر وەکی دبێژت: ((**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ**)) (**الحجرات ١٥**).

ئانكو: ب ڕاستی باوەردار ئەو کەسەنە، ئەوێن باوەری ب خودێ و پێغەمبەری ئینایین، و د ڤی واریدا وان چو گومان و دودلی نەماییە، ئەڤ ئێقین و پشتڕاستییە وە ل وان دکەت، کو ب مال و جانڤە، د ڕێکا خودێدا خەبات و بزاڤێ بکەن، و ئەڤەنە د گەل باوەرا خوە ڕاستگۆ و سەرڕاست.

**پسیار:**

١- باوەر (ئیمان) چیە؟

٢- باوەردارێ ڕاستانی کییە؟

٣- باوەرێ چ هەڤبەندی ب تەناهییا دەروونیڤە هەیە؟

**دان و ستاندن:**

هەڤبەندی د ناڤبەرا باوەرێ و کریارا قەنجدا چیە؟

## وانەیا دوویێ

# باوەر و بەختەوەری

## ڕۆلێ باوەریێ د بەختەوەرکرنا مرۆڤیدا

بەختەوەری، بۆ وێ ڕەوشێ دئێتە گۆتن، ئەوا مرۆڤ تێدا هەست ب خوەشی و ڕازیبوونا دەروونی دکەت و خەمێ ژ ڕۆژێن بۆری ڕانەکەت و ترسا پاشەڕۆژێ، ژیانێ لێ نەخوەش و تەحل نەکەت.

دیارە بەختەوەری ئەو ئارمانجە ئەوا هەر مرۆڤەك بزاڤ و پێکۆلێ بۆ دکەت و دڤێت د ژیانا خوەدا بگەهتێ و ب خوەشی بژیت. چونکی مرۆڤ ب سروشتێ خودێچێکرییێ خوە، ژ ئێش و نەڕوحەتی و بەختڕەشی و چارەڕەشییێ بێزارە. ئیسلام ژی هاتییە دا کو پێکۆلا بەختەوەرکرنا مرۆڤی د هەردو دنیایاندا بکەت.

بەلێ مرۆڤ د دیارکرنا هۆکار و ژێدەرێن بەختەوەرییێدا د گەل ئێکدو یەکسان نینن و ئێك هزرێ ناکن، ل دەڤ هندەکان بەختەوەری د دەولەمەندی و مال و سەر و سامانیدایە، هندەك ژی د پێك و پایە و پەیسك و ناڤ و دەنگاندا دبینن... هتد، ئەرێ ئەڤ هزر و بۆچوونە ڕاستن؟ ئەرێ هەمی دەولەمەندێن جیهانێ یان کارب و ستێر و کەسێن ناڤدار د ژیانا خوەدا بەختەوەرن؟ واقیع دبێژتە مە، نەخێر، دۆزا بەختەوەرییێ نە ب ڤی ئاوایییە، چونکی گەلەك دەولەمەند و ستێرێن سینەمایی و هونەری و کاربدەست و کەسێن ناڤدار، ب زمانێ خوە و د بیرهاتن و وەسیەتنامەیێن خوەدا، وەسا داییینە دیارکرن کو ئەو د ژیانا خوەدا بەختڕەش و بێکەیف بوون.

هندەك ژ وان، ژ بەر گەلەك ئێش و نەخوەشییێن دەروونی و ژ ژیان بێهیڤیبوونێ، ڕێکا خوەکوشتنێ گرتینە، نهینییا ڤێ ڕەوشێ ژی، د هندێدایە کو بەختەوەری و هەستکرن ب ڕازیبوونا دەروونی، بەری هەر تشتەکێ، هەڤبەندی ب ناڤزك و دل و دەروونێ مرۆڤیڤە هەیە.

جهێ دورستێ بەختەوەرییێ، دل و دەروونێ مرۆڤییە، هەر ژ بەر هندێ ژی، دبت مرۆڤ بێ کو خودان سەر و سامان و پێك و پایەیەکا بلند ژی بت، د ژیانا خوەدا بەختەوەر بت. کەسێ هەمی پێڤییێن ماددی یێن ژیانەکا خوەش ب دەستڤە هاتین و د گەل هندێ ژی هەر هەست ب بەختڕەشی و نەخوەشییێ دکەت، وەکی وی کەسییە ئەوێ گەلەك تێنی بت، بەلێ شوونا ب ئاڤڤەخوارنێ تێنا خوە بشکێنت، ئاڤێ ب سەرێ خوەدا بکەت، کو ئاشکەرا و دیارە ب ڤی کار و ڕەفتاری ئەگەر بۆ دەمەکی کورت ژی تێنا وی کێم ببت، مفایێ وی نادەت و دڤێت بۆ شکاندنا تێنا خوە هەر ئاڤێ ڤەخوت. ڤێجا هەست ب بەختەوەریکرنا مرۆڤی ژی د دل و دەروونانداِیە، تشتێن پێشچاڤێن بەردەست، دبت هاریکار بن، بەلێ ب تنێ نەشێن مرۆڤی بەختەوەر بکەن، ب ڕامانەکا دی، د چاڤێ ئیسلامێ ب خوەدا ژی، هندەك مەسەلەیێن ماددی و بەردەست، ڕۆلێ خوە د بەختەوەرکرنا مرۆڤیدا هەیە، ئەڤە نائێتە ئینکارکرن، هەر وەکی پێغەمبەرێ مە (سلاف لێ بن) دبێژت: ((من سعادة إبن آدم: المرأة الصالحة، والمسكن الصالح، والمركب الصالح))، پێشەوا ئەحمەد ڤەگوهازتییە. ئانکو: چەند تشتەك ژ بەختەوەریا مرۆڤینە: هەڤسەرا باش، و ئاڤاهییێ باش، و ئالاڤێ باشێ ڤەگوهازتنێ.

بەلێ بەری ڤان هەمی تشتان، دڤێت مرۆڤی ب خوە، دل و دەروونەکی باش هەبت، و ژ دل هەست ب خوەشییێ بکەت، دا بشێت ب ئاوایەکی باشتر، مفایی ژ هەمی دان و کەرەم و نیعمەتێن ماددی وەربگرت و گەلەك تامێ ژێ ببینت. کابرایەکێ بەری خوە بکوژت، نامەیەك نڤیسیبوو، تێدا هاتبوو: (( ئەز خۆرتەکی لەشساخم و من هەڤسەرەکا ل دووڤ دلێ خوە هەیە و من گەلەك پارە ژی هەیە، چ یێ دلێ من بخوازت، ل بەر لەپێ منە، وەکی هۆسایە، ڤێجا ما ئەز بۆ چ بژیم؟ )).

وەسا دئێتە ساکرن و دیتن، کو ژیان د چاڤێ ڤی کابراییدا، بووییە بازنەکی دائێخستی و دوبارەکرنا کۆمەکا تشتان. ئەها د ڤی واریدا (باوەر)ێ ڕۆلەکی مەزن و بنیاتی د بەختەوەرکرنا مرۆڤیدا هەیە. ئەڤ ڕاستییە ژی، گەلەك جاران و ب گەلەك ڕەنگ و ئاوایان، ژ بەرێ زانایێن دەروونناس و خودێناسێن مەزنڤە، هاتییە دەرەهیکرن (دیارکرن). چونکی (باوەر) سەرەدەرییێ د گەل دل و دەروونێ مرۆڤی دکەت، و ب ڕێکا وان ژی، تێکلی هزرکرن و ژیانا مرۆڤی دبت، و ب گەلەك ڕەنگ و ڕوویان هاریکارییا مرۆڤی دکەت، دا مرۆڤ د ژیانا خوەدا، ژ بەختڕەشی و نەخوەشییێ دوور بکەڤت، و ژیانەکا تەناتر و بەختەوەرتر ڕابۆرینت، د ڤی واریدا، ئەم دشێین ئیشارەتێ بدەینە گەلەك خالان ژ وان:

١- ئەم ب ڕێکا باوەرێ، ب ژێدەرێ ڤێ هەبوونێ و چێکەرێ خوە و ئەرد و ئاسمانانڤە، ئانکو خودایێ پەروەردگارڤە، دئێنە گرێدان. مرۆڤێ باوەری ب خودایێ مەزن هەبت، و ب ناڤێن وی یێن پیرۆز بنیاست، هەست ب تنێیاتی و لاوازی و بێ پشتی ل دەڤ نامینت و د دەمێن خوەشی و نەخوەشی و تەنگاڤییاندا، دشێت پشتا خوە ب خودایێ دلۆڤان گرێبدەت و دلێ خوە بۆ ڤەکەت و داخوازا هاریکارییێ ژێ بکەت. ئەڤە ژی شیانا ڕوو ب ڕووبوونا ئارێشەیێن ژیانێ ل دەڤ پەیدا دکەت، و ناهێلت تێکچۆن و تەقەلەق بکەڤتە هەڤسەنگییا دەروونییا وی.

٢- مرۆڤ ب ڕێکا باوەرێ چاڤرۆن دبت و بەرسڤا ڤان پسیارێن گرنگێن ژیانێ ب دەست دکەڤن: ئەز ژ کیڤە هاتیمە؟ بۆ چ ئەز هاتیمە و ئارمانج ژ ڤێ ژیانێ چیە؟ کیڤە دێ زڤڕم و چارەنڤیس پشتی مرنێ چیە؟ مرۆڤ ب وەریسێ باوەرێ و ب ڕێکا قورئانا پیرۆز، ب سەر بەرسڤا ڤان هەمی پسیاران هلدبت، و ب ڤێ چەندێ تەناهی دکەڤتە گیانێ وی و خوە بەختڕەش و بێ خودان نابینت.

٣- باوەر مە فێری ڤەنجیکارییێ دکەت، و ڤەنجیکار ژی نێزیکی سۆز و دلۆڤانییا خودایێ خوەنە: (( ... إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ )) (الأعراف ٥٦). ئانکو: ب ڕاستی دلۆڤانییا خودێ نێزیکی ڤەنجیکارانە، ئەو مرۆڤێ د ژیانا خوەدا هەست ب سۆز و دلۆڤانییا خودایێ مەزن بکەت، زێدەتر هەست ب خوەشییا ژیانێ و بەختەوەرییێ دکەت.

٤- باوەر وە ل مە دکەت کو ئەم خەمێ بۆ یێ بۆری نەخوین و ژ پاشەڕۆژێ ژی نەترسین، چونکی دا ئەم هەست ب بەختەوەرییێ بکەین، دڤێت ئەم ژ ڤان هەردو هەستان ڕزگار ببین، کوپیتکا بەختەوەرییێ ژی تنێ د

بەهەشتێدایە، چونكی مرۆڤ تێدا نە خەمێ بۆ یێ بۆری دخوت و نە ژ پاشەڕۆژا خوە دترست. تشتێ تێدا دبینت و وەردگرت هەتاهەتایی و نەمرە، و هەر تشتەكێ دلێ وی بخوازت و بڤێت ب دەست دكەڤت. د ژیانا دنیایێ ژیدا، باوەر مە وەسا تێ دگەهینت، كو پێدڤی ناكەت ئەم خەمێ ژ یێ بۆری بخوین، چونكی ئەگەر مە ب باشی و قەنجیخوازی ژیانا خوە ڕابۆراند، دڤێت سوپاسیا خودێ ل سەر بكەین، و نە جهێ خەمخوارنێیە. ئەگەر ژ خوە مە بێفەرمانییا خودێ تێدا كر و مە ب نەباشی ڕابۆراند، هنگێ ژی دیسا ب خەمێ چارەسەر نابت، و ئەم دشێین ب پەشێمانبوونێ و داخوازا لێبۆرینێ ژ خودایێ مەزن و گوهۆڕینا ژیانا خوە، خودێ ژ خوە ڕازی بكەین و ژیانا خوە ژی بەر ب بەختەوەرییێڤە ببەین. ناكێشتە هندێ ئەم ژ پاشەڕۆژێ بترسین، چونكی ب تنێ هند بەسە كو ئەم بڕیارێ بدەین و تێدا ل دووڤ ڕێ و نیشاندانا خودایێ مەزن ژیانا خوە ڕابۆرینن و مرۆڤەكی قەنجیخواز و كەرە بین د ناڤ جڤاكا خوەدا، ئەم دێ ژ خوارنا خەما یێ بۆری و ترسا پاشەڕۆژێ ڕزگاربین و دێ كوڕێن ڕۆژێ بین، ئەڤە ژی ئەو تشتە، ئەوێ زانستێ وەراركرنا مرۆڤێ هەڤچەرخ، بەردەوام بەرێ مە ددەتێ. زانایێن ڤی واری دبێژن: مرۆڤ هندی د زیندانا ڕابۆریدا بژیت و خوە ژ پاشەڕۆژێ بترسینت، هەست ب بەختەوەری و تەناهی و دلخوەشییێ ناكەت و پێدڤییە كوڕێ نها بت و د ڕۆژا خوەدا بژیت.

٥- ئەم ب ڕێكا باوەرێ ل سەر ڕێ و نیشانێن خودایێ پەروەردگار دچین، وی ژی سۆز وپەیمان دایینە مە كو هەر كەسەكێ ب ڤی ڕەنگ و ئاوایی بژیت، دێ ژ بەختڕەشی و تەنگاڤی و چارەڕەشییێ دوور بت: ((... فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ﴿١٢٤﴾ )). (طه ١٢٣ - ١٢٤). ئانكو: هەر كەسەكێ ڕێكا من بگرت، نە گومڕا دبت نە ژی بەختڕەش.. و هەر كەسەكێ خوە ژ هزر و ڕێبازا من بدەتە پاش، دێ ژیانەكا تژی تەنگاڤی و دلنەخوەشی ڕابۆرینت. چونكی ب تنێ باوەرا ڕاستانییە كو مرۆڤی ژ ئێش و نەخوەشییێن دەروونی دپارێزت و د ژیانێدا ژی هاریكارییا وی دكەت، دا ب ڕەنگ و ئاوایەكی وەسا بژیت، ماڤێ ڕوح و عەقل و لەشێ خوە بدەتێ، و د ژین و ژیارا خوەدا مرۆڤەكی باش و گەشبین بت.

٦- باوەر مە بۆ قەنجیكرن و هاریكاریكرنا غەیری خوە پالددەت، پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەكێدا دبێژت: ((پشتی باوەریئینانێ ب خودێ، تشتەك تەمەت خوەشكرنا دلێ موسلمانی ل دەڤ خودێ ب بها نینە))، زانستێ دەروونناسی و وەراركرنا مرۆڤی ژی قەویاتییێ ل سەر هندێ دكەت، كو ئێك ژ ڕێكێن ب دەستڤەئینانا بەختەوەرییێ، ئەو بزاڤ و پێكۆلە، ئەوا مرۆڤ بۆ دلخوەشكرنا غەیری خوە دكەت. د. یۆری ریوریكوف د كتێبا (ڤیان و هێزا دەروونی) دا دبێژت: ((ئەو هاریكارییا مرۆڤ بۆ غەیری خوە دكەت، پێل ولێمشتا هەستەكا باش و شاریان و ئاریانەكا پۆزەتیف ب سەر گیانێ ویدا بەرددەن، پێ ناڤزك و دل و گیانێ وی زەلال و پاقژ دكەن و برینێن وی دەرمان دكەن و ددەنە ئێك و هەستێن تایبەتێن وی بەرانبەری خوە ب خوە، ساخلەم و باشتر دكەن، و هەست ب كێماسی و هندابوونێ د دەروونێ ویدا لاواز دكەن)).

## پسیار:

١- بەختەوەری چیە و چاوا هەست پێ دئێتە کرن؟

٢- بۆ چ مرۆڤێ باوەردار و تێگەهشتی د ژیانێدا، ژ غەیری خوە بەختەوەرترە؟

٣- ئەرێ بەختەوەری تنێ ب مال و سەر و سامان و ناڤ و دەنگ و پێك و پایەیان ب دەستڤە دئێت؟ بۆ چ؟

## دان و ستاندن:

باوەرێ چ کارلێکرن د بەختەوەرکرنا خۆرتان و کێمکرنا ئارێشەیێن دەروونیدا هەیە؟

## وانەیا سێیێ

## بوونەوەر و ژیان و مرۆڤ د دیتن و چاڤێ ئیسلامێدا

**ئـ- بوونەوەر د چاڤێ ئیسلامێدا:**

ئێك - ئیسلامێ دیتنەکا تایبەت هەیە، بۆ بوونەوەری و ژیانێ و مرۆڤی، کو ئەڤ دیتنە وێ ژ هندەك ئالییانڤە، ژ ئایین و بیر و باوەڕێن دی جودا دکەت، هەر کەسەکێ قورئانێ بخوونت، هەست دکەت کو خودایێ مەزن بوونەوەر کرییە کتێبەکا ڤەکری، مرۆڤ دشێت ب ڕێکا هزرکرنا خوە د دیمەن و بەلگە و نیشانێن ویدا، ب سەر مەزنایی و تەکووزییا خودایێ مەزن هلببت، یاسا و ڕاستییێن ڤی بوونەوەری بەلگە و نیشانن ل سەر هوورکاری و موکومی و پێکڤەگونجانا پشك و پارچەیێن وی، قورئان بەحس و دابێشا سروشت و پێکهاتن و هندەك ژ تایبەتمەندییێن گەردوونی دکەت، هەر وەسا هندەك ژ یاسا و ئارمانجێن چێکرنا وی و بناخە و بنیاتێن پێکهاتنا وی ڕۆن و ئاشکەرا دکەت، خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا دبێژت: (( **إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ** )) **(الأعراف ٥٤)**. ئانكو: ب ڕاستی پەروەردگارێ هەوە کو ئەسمان و ئەرد د شەش ڕۆژاندە چێکرینە و پاشێ ل سەر عەرشی ڕوونشت، شەڤێ ب سەر ڕۆژێدا دئینت، دێ بێژی هەردو بەڕەبەزینکێ د گەل ئێکدو دکەن، هەر وەسا ڕۆژ و هەیڤ و ستێر سەرێ گوهدارییێ بۆ فەرمانا خودێ دچەمینن، ئەرێ ما ژێدەرێ چێکرن و فەرماندارییا ڤی گەردوونی نە ئەوە؟ پاکی و پاقژی بۆ وی خودایێ کو چێکەر و خودانێ هەمی جیهانانە.

دوو - ڤێجا مەخسەد ژ چێکرنا بوونەوەری، ب ڤی ئاوایێ نها، خزمەتکرنا مرۆڤی و دابینکرنا پێڤییێن ژین و ژیارا وییە، هەر وەکی خودێ دبێژت: (( **... أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ...** )) **(لقمان ٢٠)**. ئانکو: د دیتنا باوەرا ئیسلامیدا، مرۆڤ پشتی خودایێ مەزن، سەرداری ڤی بوونەوەرییە، هەمی چێکرییێن دی، د خزمەتا ویدانە. دا بشێت ژ ئالییەکێ ئەرکێ بەنداتییێ بۆ خودایێ خوە ب جه بینت، و ژ ئالییەکی دی، دا مفایی ژ خێر و بێرێن بوونەوەری وەربگرت و ژین و ژیارەکا خوەش و بەختەوەر ل سەر ببۆرینت.

ل دووڤ ڤێ دیتنێ بۆ بوونەوەری و پێك و پایە و جهێ مرۆڤی تێدا، مرۆڤ سەرێ خوە بۆ چو تشتی د سروشتیدا ناچەمینت، و ژ دیاردەیێن سروشتی ناترست و ب ئاوایەکی نەزانستی ڕاڤە ناکەت.

سێ - ئیسلام دیتن و بۆچوونەکا ڕاست و دورست دەرهەڤی بوونەوەری ددەتە مە، بۆ مە دیار دکەت کو ڤی بوونەوەری خودایەك هەیە، ژ بەرێ ویڤە، ئەڤ بوونەوەرە هاتییە چێکرن، و ل دووڤ هندەك یاسا و دەستووران ڕێکخستییە و هەر ل دووڤ وان ب ڕێڤە دچت و دگەڕت. و ئەڤە ژی وێ ڕامانێ ددەت کو ئەڤ بوونەوەرە بابەت و جهێ هزرکرن و کوور بەرێخوەدانا زانستییە، دا ئەم ب سەر نهینی و یاسا و دەستوورێن وی هلببن و پتر خزمەتا مە بکەت. و هەر ل دووڤ ڤێ دیتنێ ژی، و د چاڤێ بیر و باوەڕێن ئیسلامیدا، بوونەوەر

نە دژمنێ مەیە، دا ئەم ل بەر بگەڕین و بزاڤێ بکەین، خوە ب سەر بێخین و تۆلەیا خوە لێ ڤەکەین، چونکی ئەڤ جوونە دیتن و بەرێخوەدانە، بەرێ مە ددەتە هندێ، کو ئەم ژینگەهێ و سروشتی وێران بکەین، دا ژ ژێدەر و سەرەکانییا خێر و دانێ -ژ هندەك ئالییانڤە -بێتە گوهۆڕین و ببتە ژێدەرێ گەف و ترسێ بۆ ژیان و مرۆڤاتییێ، هەر وەکی نها کو ژ بەر زێدەپیسکرنا ژینگەهێ ژ بەرێ دەولەتێن ڕۆژئاڤاییڤە و هندەك وەلاتێن پیشەسازییێن دی، ترس ل سەر چینا گازا ئۆزۆن پەیدا بوویییە و کارەساتێن سروشتی ب ئاوایەکی بەرچاڤ زێدەبوویینە، کو ئەگەر مرۆڤاتی سینۆرەکێ بۆ ڤێ سەرەدەرییا نەدورست د گەل سروشتی نەدانت، دڤێت خوە بۆ کارەسات و خرابییێن مەزنتر بەرهەڤ بکەت. سروشت و بوونەوەر ل دووڤ دیتن و چاڤێ جیهانبینییا ئێکتاپەرێسییێ و بیر و باوەرێن ئیسلامی، وەکی پیشانگەهەکا خەملاندییا خودایییە، و فەرە مرۆڤ خوە نێزیکی وێ ببینت و هەست بکەت کو دڤێت، و د گەل وێ پێکۆل و بزاڤا دکەت کو مفایی ژێ ببینت، دڤێت بەرگەڕیانا هندێ ژی نەکەت، کو جوانییا وێ کرێت بکەت، دا مەرجێن ژین و ژیارێ تێدا بەردەوام بمینن و پێشکەڤتنا زانستی ژی، ژ هۆکارێ خوەشکرنا ژیانێ، نەبتە ئەگەر و هۆکارێ ترس و وێرانکرنێ.

چار - ل گۆڕ بەرێخوەدان و دیتنا ئیسلامێ، بوونەوەر ئارمانجدارە و بێ ئارمانج و ژ خوە نەهاتییە چێکرن: خودایێ مەزن دبێژت: (( **وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَٰلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ** )) (ص ٢٧). ئانکو: مە ئەسمان و ئەرد ژ ڤەستان و بێ ئارمانج چێنەکرینە، ئەڤە ئەو هزر و گومانە ئەوا خودێنەناس ل سەر.

ئانکو ئەقلێ باوەردار دزانت کو ئەڤ بوونەوەرە ژ خوە و بێ ئارمانج نەهاتییە چێکرن، چونکی بێئارمانجی و ژ خوەچێکرن، دوورن ژ حیکمەت و زانین و زانابییا چێکەری کو خودایێ مەزنە، د بوونەوەریدا، هەر تشتەك بۆ ئارمانجەکێ هاتییە چێکرن و هەر تشتەکێ ئەرکەك هەیە.

خودایێ مەزن، ڤێ چەندێ، د قورئانا پیرۆزدا، و ل سەر زمانێ کۆمەکا باوەردارێن ب سەر ڤێ ڕاستییێ هلبوویین، وەك کەڤالەکی تژی هەست و نازکی و لڤین ڕۆن و بەرچاڤ دکەت و دبێژت: (( **إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠)** )) (آل عمران ١٩٠). ئانکو: د چێکرنا ئەرد و ئەسمانان و جودابییا شەڤ و ڕۆژاندا گەلەك بەلگە و نیشان هەنە بۆ کەسێن خودان ئەقل -ئەوێن ئەقلێ خوە بۆ دیتنا ڕاستییان ددەنە کاری. ئەڤ باوەردارێن د ئامانجداربوونا بوونەوەری گەهشتین، و دزانن کو مرۆڤ ژی بۆ ئارمانجەکێ هاتییە چێکرن و دڤێت بۆ وێ ئارمانجێ بژیت، دزانن ئەو ئارمانج ژی، ب ڕێکا گوهداریکرنا پەیاما خودێ و سرووشی، دئێتە دیتن و دەرەهیکرن، دبێژن: خودێوۆ، مە گازییەك بهیست، بانگ و گازی بۆ باوەرێ هلددێرا، و داخواز دکر کو ئەم باوەرییێ ب خودایێ خوە بینین، مە ژی داخوازا وێ گازییێ ب جهکر و مە باوەری ئینا، خودێوۆ، دێ تو ژی ل گونەهـ و خەلەتییێن مە ببۆرە و چاڤێن خوە ژێ بگرە، و مە د گەل ڤەنجیکاران بمرینە و مە ب بال خوەڤە ببە.

خودێوۆ، وان سۆز و پەیمانان بۆ مە ب جە بکە، ئەوێن تە ل سەر زمانێ پێغەمبەرێن خوە داینە مە، و ڕۆژا قیامەتێ مە ڕووڕەش و شەرمزار نەکە، بێ گومان تو سۆز و پەیمانان ناشکێنی و دێ هەر وان ب جە ئینی. خودایێ مەزن ژی، پارپار و لاڤلاڤا وان وەرگرت و پشتڕاست کرن، کو ئەو پشتا خوە نادەتە کار و کریارێن چو باوەرداران، چ ژن بن چ ژی مێر، ژن و مێرێن باوەردار ڕێز و کەرامەتەکا وەکی ئێك ل دەڤ وی هەیە، و هەردو جوون ژ ئێکدو پەیدابوویینە، هەر وەسا خودایێ مەزن دبێژت: (( **وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاعِبِينَ** )) (الانبیاء ١٦). ئانکو: مە ئەسمان و ئەرد بۆ یاری و بێ ئارمانج چێنەکرینە. ئانکو ئەگەر مرۆڤی ل دووڤ ڕێبازەکا دورست و ب جوانی ئەقلێ خوە ب کار ئینا، و هزرا خوە د سروشت و ئەسمانان و ئەردی و بەلگە و نیشانێن خودایێ مەزندا کر، ب خوە دێ گەهتە وێ ڕاستییێ کو بوونەوەر ئارمانجدارە، و دێ ب سەر پەندیاری و هوورکاری و مەزناتی و فلیکارییا پەروەردگاری هلبت، د ڤی بوونەوەریدا.

## پسیار:

١- ئەرێ د چێکرنا بوونەوەریدا ئارمانجەك هەیە؟ ئەگەر هەیە، ئەو چیە؟

٢- دەمێ خودایێ مەزن دبێژت، مە بوونەوەر ژ خوە دورست نەکرییە، چ ڕامانێ ددەت؟

٣- هەڤبەندی د ناڤبەرا ئارمانجداربوونا بوونەوەری و ژیانا مرۆڤیدا ل سەر ڤی ئەردی چیە؟

٤- ب دیتنا ئیسلامێ، هەڤبەندی د ناڤبەرا مرۆڤی و بوونەوەریدا چیە؟

## ئەرك:

بوونەوەری گەلەك بەلگە و نیشان تێدانە، کو دیار دکەن، خودایێ مەزن چێکەرێ بوونەوەرییە، و وی بوونەوەر ژ خوە دورست نەکرییە، چەند بەلگە و نیشانەکان ژ وان بنڤیسە؟

## دان و ستاندن:

خودایێ مەزن، بوونەوەر ئێخستییە د بن دەستێ مرۆڤیڤە، و بۆ خزمەتکرنا وی سەرنەرم کرییە، ڤێ چەندێ چ کارلێکرن ل سەر هزرکرن و ژیانا مرۆڤی و جڤاکێ هەیە؟

## وانەیا چارێ

# باوەر و ڕاستییا پشتگرێدانێ ب خودایێ مەزنڤە

ئەم دشێین ب ڤی ئاوایی پشتگرێدانێ ب خودایێ مەزنڤە بدەینە ناسین: کو ئەوە بەندەیی باوەری ب خودایێ مەزن هەبت، و کار و بارێن خوە بسپێرتێ، و باوەری هەبت ب کارسازی و هاریکارییا وی، ئەڤە ژی هندێ دیار دکەت، کو پشتگرێدان ب خودایێ مەزنڤە، ژ دلێ باوەردار دەردکەڤت و ژێدەرێ وێ پشتگرێدانێ، باوەرییا مرۆڤییە ب خودایێ خوە؛ خودایێ هەمی جیهانان. چونکی پشتگرێدان ب خودێ ئێکە ژ بەر و بەرهەمێن شرینێن باوەرییێنانێ ب خودایێ مەزن و ناسکرنا پەسن و سیفەتێن وی.

## باوەردار پشتا خوە ب خودایێ خوە گرێددەن

ئێك ژ بەر و بەرهەمێن باوەرێ، پشتگرێدانە ب خودێ. باوەردار ژی کەسەکە باوەری ب خودایێ خوە هەیە، و پشتا خوە پێ گرێددەت، و بۆ هەوجەیی و پێڤییێن خوە یێن ماددی و مەعنەوی، داخوازا هاریکارییێ ژێ دکەت. ئانکو پشتگرێدان ب خودێ، ئێکە ژ نیشانێن باوەرییێنانێ، هەر وەکی قورئانا پیرۆز دبێژت: (( ... وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ )) (المائدة ١١). ئانکو: بلا باوەردار ب تنێ پشتا خوە ب خودێ گرێبدەن.

## پشتگرێدان ب خودێ و بزاڤ و پێکۆلا مرۆڤی

ئەڤ دابێشە ئێکە ژ گرنگترین بابەتێن گرێدایی ب دۆزا پشتگرێدانێ ب خودێڤە و ژ کەڤندا گەلەك ئاخڤتن ژ بەرێ زانایانڤە ل سەر هاتییە کرن، و ناڤەرۆکا ڤێ دۆزێ ژی ئەوە، کا پشتگرێدان ب خودێ و سپارتنا کار و باران ب بال ویڤە، و باوەری ب هاریکاری و دلۆڤانییا وی، د گەل بزاڤ و خەبات و نەخشەکێشان و مفاوەرگرتن ژ ئالاڤ و هۆکارێن سروشتی و ماددی دگونجت یان نە؟

ب ڕاستی، دەمێ ئەم هزرا خوە د قورئانێدا دکەین، و دەمێ ئەم ژیاننامەیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و یا هەڤال و هۆگر و دووکەفتییێن وی و مرۆڤێن باش و تەقوادار ڤەدکۆلین، ب سانەهی ئەم دگەهینە وێ قەناعەتێ کو ئەڤ هەردو تشتە ب چو ڕەنگ و ئاوایان د گەل ئێك ڤێکنەکەفتی نینن، بەلکو تەمامکەرێن ئێکدونە و هەر ئێك ژ وان بەحسێ ئالییەکی کار و بزاڤ مرۆڤێ باوەردار دکەت. خودایێ مەزن د قورئانێدا دبێژت: (( وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى )) (النجم ٣٩). ئانکو: مرۆڤ ژ بلی بزاڤ و پێکۆلا خوە، نابت ل بەندا تشتەکی دی بت.

خودایێ مەزن ل دۆر ڕێڤەبرنا کار و باران دبێژتە پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن): ((... وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ...)) (آل عمران ١٥٩). ئانکو: شێورا خوە ب هەڤال و هۆگرێن خوە بکە و دان و ستاندنێ ل دۆر کار و باران د گەل وان بکە، و پشتی تو گوهدارییا بیر و بۆچوونێن وان دکەی و ئەرك دئێنە دەستنیشانکرن، و بڕیارەکا ڤەبڕی دئێتە دان، پشتا خوە ب خودێ گرێبدە.

ل ئێرە ئەم دبینین کو پشتگرێدان ب خودێ، پشتی وان هەمی کار و کریارێن پێڤی هاتییە، ئەوێن بۆ دانا بڕیارەکا ڕاست و دورست هاتینە کرن، هەر وەسا پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) د بەرسڤا زەلامێ گۆتی: ((ئەز دێ دەوارا خوە بەردم و هێلمە ب هیڤییا خودێڤە))، بۆچوونا وی یا خەلەت و نەدورست، بۆ وی و هەمی باوەرداران ڕاستکر و گۆت: ((اعقلها ثم توكل على الله )). ئانکو: گرێبدە و ژ نوو پشتا خوە ب خودێ گرێبدە. ئانکو پشتگرێدان ب خودێ وەك هەست، ژ بلی کو ژ دلی دەردکەڤت، ژێدەرێ وێ ب خوە ژی بزاڤ و خەبات و نەخشەکێشانە. چونکی خودایێ مەزن، ڤی گەردوونی ل دووڤ کۆمەکا دەستوور و یاسایان ب ڕێڤە دبەت، و بۆ کەسێ وان دەستوور و یاسایان ناگوهۆڕت. بۆ نموونە: شیانا سۆتنێ داییە ئاگری، و ئەڤ شیانە، بۆ باوەردار و بێباوەری ژی وەکی ئێکە، ئانکو کا چاوا بێباوەرەکێ دسۆژت، وەسا باوەرداری ژی دسۆژت، ژ بلی وێ ڕەوشا تایبەت، ئەوا ئیرادە و ڤیانا خودێ، تێدا دبتە ڕێگر و ناهێلت ب کارێ سۆتنێ ڕابت، هەر وەکی خودێ بۆ پێغەمبەرێ خوە ئیبراهیم (سلاڤ لێ بن) کری و ئاگر سارکری، دا پێ نەئێتە سۆتن.

## شوونوار و بەر و بەرهەمێن پشتگرێدانێ ب خودێ

گومان تێدا نینە، کو پشتگرێدان ب خودێ، شوونوار و بەر و بەرهەمێن مەزن هەنە، ڕەنگ و نیشانێن خوە ل ژیانا مرۆڤێ باوەردار دکەن. ل خوارێ و ب کورتی ئەم دێ هندەك ژ ڤان شوونوار و بەرهەمان دیارکەین:

١- پشتگرێدان ب خودێ و خوەڕاگری بەرانبەری ئارێشە و گرفتارییان:

ژ ئالییەکێڤە کەسێن باوەردارێن پشتا خوە ب خودێ گرێددەن، بەرئەنجامێ کارێ خوە دسپێرنە خودێ، ئەو خودایێ ل هەمی جهان و خودان شیان ل سەر هەر تشتەکێ، و بەر و بەرهەمێ ڤێ باوەر و قەناعەتێ، پشت ب خوە گرێدان و خوەڕاگرییە بەرانبەری ئارێشە و گرفتارییێن ژیانێ. دەمێ مرۆڤ هەست دکەت، کو نە ب تنێیە بەرانبەری ئارێشە و گرفتاری و نەخوەشییان، و خودێ د گەل مرۆڤییە، و مرۆڤ دشێت هەوارا خوە بگەهینتێ، و پشتا خوە پێ گرێبدەت، و داخوازا خوەڕاگری و هاریکارییێ ژێ بکەت؛ هنگێ هەست ب لاوازی و بێهیڤیبوونێ ل دەڤ نامینت، و شوونا خوە بسپێرتە ڕەشبینی و لاوازییێ، ب ڕێکا پشتگرێدانێ ب خودێ، دێ دۆمێ دەتە ژیانا خوە و بەرانبەری پێپەست و نەخوەشییان، دێ خوە ڕاگرت، و دێ زانت ژی، کو د گەل هەر تەنگاڤییەکێ، ڕزگاری و بەرفرەهی هەیە. (( ... وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ...)) (الطلاق ٣). ئەوێ پشتا خوە ب خودێ گرێبدەت، خودێ بەسی وییە. (( وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ )) (ابراهيم ١٢). ئانکو: ئەو چیە وە ل مە بکەت، کو ئەم پشتا خوە ب خودێ گرێنەدەین، و ئەوە (خودێیە) ئەم ڕاستەڕێ کرین، و ئەم دێ بێنا خوە ل سەر ئیزادانا هەوە فرەهـ کەین، بێ گومان، ئەوێن ل بەر، کو پشتا خوە ب ئێکێ گرێبدەن، دڤێت پشتا خوە ب خودێ گرێبدەن و ڤاهیم بکەن.

و بەرانبەری هەمی تەنگاڤییان ژی، سروودا نەمرا باوەرداران ژی، ب درێژاهییا دیرۆکێ هەتا ڕۆژا ئاخرەتێ، ئەڤەیە: (( ... حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ )) (ئال عمران ١٧٣). ئانکو: خودێ بەسی مەیە بۆ پشتەڤانییێ، ئەو باشترین پشتەڤان و هاریکارە.

٢- هەستکرن ب هێز و شیانا بڕیاردانێ: دەمێ مرۆڤی بڕیار دا، پشتا خوە ب خودێ گرێبدەت، ژ ڕەوشا دودلی و خودووکێ (قەلەقێ) قورتال دبت، ب هیڤی دکەڤت ژ هاریکاری و پشتەڤانییا خودێ، چونکی ئێك ژ وان تشتێن کو نەهێلت مرۆڤ د دەمێ پێدڤیدا بڕیارێ بدەت، هەستکرنە ب نەبوونا پشتەڤانییێ و بێباوەری ژ سەرکەڤتنێ، و هەستکرن ب نەشیانێیە. بەلێ د ڕەوشا پشت ب خودێ گرێدانێدا، مرۆڤ هەست دکەت کو خودێ هاریکارە و پشتا وی دگرت، ژ ڤێرێ ب مێرخاسی و بێ ترس، پێگاڤان دئاڤێژت و د دەمێ پێدڤیدا بڕیارێ ددەت و هەست ب بێخێری و لاوازییێ ناکەت، لەو قورئانا پیرۆز دبێژتە پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن): ((... فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ... )) (آل عمران ١٥٩). ئانکو: گاڤا تە بڕیار دا، پشتا خوە ب خودێ گرێبدە. هەر وەسا پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) گۆتە (ئیبن عەبباس): ((استعن بالله ولا تعجز))، پشتا خوە ب خودێ گرێبدە و خوە لاواز و بێ شیان نەدە دیارکرن. کەسێ پشتا خوە ب دەستهلاتەکا بێ تخووب و سینۆر د ڤی گەردوونیدا گرێبدەت، کو چو تشت ژ بەر دەستان دەرناکەڤت و هەمی سەرێ گوهدارییێ بۆ دچەمینن، ما چاوا هەست ب هێزا خوە نەکەت؟

٣- ب دەستڤەهاتنا حەزژێکرن و ڤیانا خودێ: ئێك ژ شوونوارێن دی یێن پشت ب خودێ گرێدانێ، ئەوە کو خودایێ مەزن ئەو باوەردارێ پشتا خوە پێ گرێددەت دڤێت و ژێ پشتڕاست دبت: (( ... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ )) (آل عمران ١٥٩). ئانکو: بێ گومان، خودێ حەز ژ وان کەسان دکەت، ئەوێن پشتا خوە پێ گرێددەن. و نە جهێ گومانێیە، کو ب دەستڤەئینانا حەزژێکرن و ڤیانا خودێ بۆ مرۆڤێ باوەردار، سەر و سامانەکی گرانبها و ب قیمەتە.

٤- هێلانا گونەهان و نەمانا دەستهلاتا شەیتانی ل سەر کەسێ پشتا خوە ب خودێ گرێدایی: باوەرییا مرۆڤی و کا چەند پشتا خوە ب خودێ گرێددەت، دو پیڤکن بۆ دوورکەڤتنا وی ژ دەستهلاتا شەیتانی، و ب هندێ ژ ڤارێبوون و کرنا خرابییێ ژی دئێتە پارزتن، خودایێ مەزن د ڤی واریدا دبێژت: (( إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ )) (النحل ٩٩). ئانکو: بێ گومانە کو شەیتانی دەستهلات و شیان ل سەر وان کەسان نینن، ئەوێن باوەری ئینایین، و پشتا خوە ب خودێ گرێدایین.

شەیتان هنگێ دشێت ل سەر مرۆڤی زال ببت، دەمێ هەڤبەندییا مرۆڤی د گەل خودێ بێخێر و لاواز بت، و مرۆڤ ب دووڤ هەوایێ سەرێ خوە و بۆرا خرابییێ کەڤتبت. بەلێ ئەگەر هەڤبەندییا وی د گەل خودێ ب هێز بت و پشتا خوە ب خودێ گرێبدەت، دێ ژ هەمی فند و فێل و خرابییێن شەیتانی دووربت.

٥- تەناهی و ئێمنییا دلی: ئێك ژ شوونوارێن (پشت ب خودێ گرێدانێ) تەناهی و ئێمنییا دلییە، پشت ب خودێ گرێدان، تۆڤێ هیڤییێ د دلێ مرۆڤیدا دچینت، و ڕێکێ خوەش دکەت، کو مرۆڤ ژ پێپەستا دەروونی و خودووك و دودلییێ قورتال ببت؛ چونکی هۆکار و ئەگەرێ سەرەکی بۆ دودلی و دلتەنگییا مرۆڤی و هەمی پێپەستێن دەروونی ئەوێن بەرهنگاری مرۆڤی دبن، ڕاڤەکرن و شرۆڤەکرنا مرۆڤی یا نەدورستە، بۆ ڕوودان و سەربۆرێن ژیانێ، و هەستکرنە ب لاوازی و نەشیان و تنێیاتییێ، و ژ ئالییەکی دیڤە، دەمێ مرۆڤ پشتا خوە ب خودێ گرێددەت، باوەرییێ ب دادپەروەری و مەزناتی و دلۆڤانی و شیانا وی دئینت و ئەڤە دلێ وی ئێمن و تەنا و پشتڕاست دکەت.

دەمێ مرۆڤی پشتا خوە ب خودێ گرێدا، هەست ب تنێیاتییێ ناکەت، و د ژیانا خوەدا، هەمی گاڤان هەست ب دلۆڤانی و چاڤدێری و سەرەگوهییا خودێ دکەت، و هۆسا هەڤبەندییا د ناڤبەرا وی و خودێدا گەرم و موکوم دبت، و ب ڤێ چەندێ، بارێ گرانێ دلتەنگی و پێپەستێن دەروونی، ل سەر سڤك دبت، یان ب ئێکجاری نامینت، و ب چاڤەکی گەشبین، بەرێ خوە ددەتە ژیانێ، و ئەگەر ژێدەرێ دلتەنگییا وی، هندەك مرۆڤێن خراب و ئێزادانا وان ژی بت، دیسا باوەر و پشتگرێدان ب خودێ، بێنا مرۆڤێ باوەردار فرەە دکەن، و وەلێ دکەن، کو گەلەك خەم و کۆڤانان نەخوت و هەر بەرێ وی ل باشییێ بت و یێ خراب ژی بهێلتە ب هیڤیا خودێڤە. خودایێ مەزن د ڤی واریدا دبێژتە پێغەمبەری (سلاف لێ بن): (( ... فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً )) (النساء ٨١). ئانکو: گوهێ خوە نەدە وان (دوڕوویان)، و ترسێ ژ پیلان و ئۆیینێن وان ڕانەکە، و پشتا خوە ب خودێ گرێبدە، بەسی تەیە کو خودێ پشتەڤان و بەرەڤانێ تەبت.

## پسیار:

١- جودایی د ناڤبەرا (پشت ب خودێ گرێدان) و (خوە هێلانە ب هیڤییێڤە) چیە؟

٢- جودایی د ناڤبەرا (پشت ب خودێ گرێدان) و (پشت ب خوە گرێدانێ) چیە؟ و وان چ هەڤبەندی پێکڤە هەیە؟

٣- بۆ چ دڤێت د ژیانێدا ئەم پشتا خوە ب خودێ گرێبدەین؟

٤- ئەرێ مرۆڤ بەس د دەمێ تەنگاڤییاندا، پشتا خوە ب خودێ گرێددەت؟

## دان و ستاندن:

هەڤبەندی د ناڤبەرا (پشت ب خودێ گرێدان) و (هەستکرن ب سەرفرازی و سەربلندییێ) چیە؟

## وانەیا پێنجێ

# پشت ب خودێ گرێدان و پشت ب خوە گرێدان

وەك پێشتر مە گۆتی، هندی قورئان و ڕێ و نیشانێن دی یێن ئیسلامینە، مە پال ددەن کو ئەم پشتا خوە ب خودێ گرێبدەین، و هندی زانایێن دەروونینە، مرۆڤی پال ددەن، کو پشتا خوە ب خوە گرێبدەت، و ئەڤە کرینە ئێك ژ سالۆخەتێن ئیجابی ل دەڤ مرۆڤی، و دبێژن کو مرۆڤ ب رێکا باوەرییێ ب خوە و پشت ب خوە گرێدانێ، دشێت رێکا خوە ل سەر نەخوەشییێن ژیانێ بگوهێزت و بگەهتە کێلکا خوەشی و بەختەوەرییێ.

ل دووڤ بیر و بۆچوون و باوەرا دەروونناسان، پشت ب خوە گرێدان، بناخە و بنیاتا هەر رزگاری و پێشکەڤتنەکێیە، ب پشت ب خوە گرێدانێ، ئیرادە و ڤیانا مرۆڤی ب هێز دکەڤت، و ب پشتگرێدانێ ب غەیری خوە، مرۆڤ بێهێز و لاواز دبت. ئەو هاریکارییا مرۆڤ ژ غەیری خوە وەردگرت، گەلەك جاران بەرێ مرۆڤی ددەتە سستبوون و خاڤبوونێ، و وە لێ دکەت، کو بزاڤ و پێکۆلا وی دۆم نەکێشت و ب دووماهی بێت.

ئەگەر وەك پێشچاڤ ئەم بەرێ خوە بدەینە ڤێ چەندێ، دێ وەسا دیار بت، کو پشت ب خودێ گرێدان، و پشت ب خوە گرێدان، د گەل ئێك ڤێکنەکەڤتینە و پێك ناکەن، و ئەو کەسێ پشتا خوە ب خودێ گرێبدەت، ئەو ئێدی نەشێت پشتا خوە ب خوە گرێبدەت، و دڤێت کار و بارێن خوە هەمییان بهێلتە ب هیڤییا خودێڤە، و ل بەندا هاریکارییا وی بت، یان ژی دڤێت پشتا خوە ب خوە گرێبدەت، و بزاڤ و پێکۆلێ بکەت، ئەو ب خوە وان کار و باران ب رێڤە ببەت، و پشتا خوە ب شیان و هێزا خوە قاهیم بکەت.

بەلێ ئەگەر مە تێگەهشتنەکا راست و دورست بۆ پشت ب خودێ گرێدانێ هەبت، و ئەم وێ و تەنبەلی و دەستشۆڕی و نەکەرییێ ژێك ڤاڤێرین، و هەر وەکی پێشتر هاتییە رۆنکرن، پشتی بەرهەڤکرنا هۆکار و ئەگەرێن ماددی و بەردەستکرنا مەرجێن سەرکەڤتنێ و پشتگرێدانێ ب شیان و هێزا مرۆڤی، ئەڤ تێگەهشتنا نەدورست د ڤی واریدا دێ ڤەرەڤت و نامینت، چونکی مرۆڤێ باوەردار ل وێ باوەرێیە، کو هەر هێز و شیانەکا ب مرۆڤی هاتییە سپارتن، ژێدەرێ وێ هەر خودایێ مەزنە، خودێ ژ بەر هندێ ئەو هێز و شیان داییێ، دا پشتا خوە ب خوە گرێبدەت، و چاڤێ وی نەمینتە ل دەستێ غەیری وی، و سەرفراز بژیت.

ب ڤی ئاوایی، پشت ب خوە گرێدان و پشت ب خودێ گرێدان، ڤێککەڤتی و گونجایینە د گەل ئێك، و ب چو ئاوایان دژی هەڤ نینن، بەلکو ژ گرنگترین بەرئەنجامێن وان، مفاوەرگرتنە ژ وان هێز و شیانێن خودێ داییینە مە، دا ئەم پێ، مێرانە بەرانبەری ژیانێ، خوە ل سەر لنگێن خوە بگرین، و بزاڤ و پێکۆلێ بکەین بۆ سەرکەڤتنێ، نە خوە تەنبەل بکەین و دەستێن خوە د بەر خوەدا شۆڕ بکەین، دا خەلك خێرهاتنان د گەل مە بکەت، و دەستێ هاریکارییێ بۆ مە درێژ بکەت. ئەڤە هەمی هندێ دگەهینت، کو پشت ب خودێ گرێدان، تێن و هێزەکا گەرمتر و مەزنتر و موکومتر ددەتە مە، کو ئەم پشتا خوە ب خوە گرێبدەین، و پتر باوەری بۆ مە چێ ببت، کو خودایەکی هاریکار مە هەیە، و ئەم دشێن پشتا خوە پێ گەرم بکەین، و ئەڤە دیسا هەستا هێز و شیان و مەزناتییێ ل دەڤ مرۆڤی گەلەکتر لێ دکەت، و وەلێ دکەت کو زێدەتر باوەری ب خوە و هێز و شیانێن خوە هەبت، و هەمی گاڤان

سوپاسییا خودێ بکەت ل سەر وان نیعمەت و کەرەم و سەرکەفتنێن ب دەستڤە هاتین، و بێنا وی، ل سەر ئاستەنگ و نەخوەشییان فرەه ببت، و د سنگێ واندا، دەستێن خوە د بەر خوەدا شۆڕ نەکەت و ل بەر بگەڕت بدەتە سەر و ب سەرفرازی، ژێ دەرباز ببەت.

## باوەر و دوعا و تەناهییا دەروونی

دوعا و پاڕپاڕ، بەر و بەرهەمێ باوەریئینانێیە ب خودێ و ناسکرنا پەروەردگاری، دوعا ئەگەرێ بلندبوونا گیانێ مرۆڤێ باوەرداره بەر ب خودێ، و تام و ترنگەکا مەزن و تەناهی و خوەشییێ دسپێرتە دل و دەروونێ مرۆڤی. دوعا ئەوە مرۆڤ داخوازا هاریکارییێ ژ خودایێ مەزن بکەت، دا هەمی پێڤی و وەجێن مرۆڤی یێن ماددی و مەعنەوی ب دەستڤەبینت و بەردەست بکەت.

## پێك و پایەیێن دوعا و پاڕپاڕێ

دوعا و پاڕپاڕێ چار پێك و پایەیێن سەرەکی هەنە، ئەو ژی ئەڤەنە:

ئێك - ئەوێ ژێ دئێتە داخوازکرن: د دوعایێدا، ئەوێ ژێ دئێتە داخوازکرن، خودایێ مەزنە. ئەو خودایێ هەمی ملکێ ئەرد و ئەسمانان یێ وی: (( أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ ولِيٍ وَلَا نَصِيرٍ )) (البقرة ۱۰۷). هەر وەسا، دان و کەرەما وی د گەل بەندەیێن وی، چو ژ گەنجخانەیێن وی کێم ناکەت: (( إِنَّ هَذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِنْ نَفَادٍ )) (ص ٥٤). ئانکو: ڕزق ژی هەر یێ مەیە و چو نەمان و دووماهی ژێ بۆ نینن. هەر وەسا دبێژت: (( ... وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ... )) (المنافقون ۷). و گرنگە ئەم بزانین کو خودایێ مەزن ب خوە، داخواز ژ مە کرییە، ئەم داخوازێن خوە ڕابەری وی بکەین و هەوارا خوە بگەهینێ، هەر وەکی دبێژت: (( وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)) (غافر ٦۰). ئانکو: داخوازێ ژ من بکەن و هەوارا خوە بگەهیننە من، ئەز دێ بەرسڤا هەوە دەم و د هەوارا هەوە ئێم، و داخوازێن هەوە ب جە ئینم، ئەوێن بەرانبەری پەرستنا من، خوە مەزن دکەن، و ژ خوە ناگرن کو هەوارا خوە بگەهیننە من، و خوە ژ من بێ منەت دکەن، بلا باش بزانن کو بەرێ وان ب ڕسوایی دێ کەڤتە دۆژەهێ و ئەو مەزناهییە د کیسێ واندا نامینت.

هەر وەسا جارەکا دی خودایێ مەزن مە ئاگەهدار دکەت، کو ئەو گەلەك نێزیکی مەیە: ((وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ... )) (البقرة ۱۸٦). ئانکو: ئەگەر بەندەیێن من داخوازێ ژ من بکەن و هەوارا خوە بگەهیننە من، بلا بزانن، ئەز گەلەك نێزیکی وانم، و دبێژت: (( ... وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ )) (ق ۱٦). ئانکو: ئەم ژ ڕها بنگوهێ وی نێزیکتری وینە. هەستکرن ب ڤێ نێزیکییێ ژ خودایێ مەزن، باوەرداریێ دوعاکەر پتر پشتڕاست دکەت و زێدەتر ب هیڤی دئێخت، کو ئەو د ڤێ هەبوون و بوونەوەرێدا نە ب تنێیە، بەلکو وی خودایەکی دلۆڤان هەیە، سەرەگوهییا وی دکەت و گوهدارییا هەمی داخوازێن وی دکەت.

دوو - دوعاکەر: ئەو باوەرداره، ئەوێ داخوازێ ژ خودایێ خوە دکەت، کو پێڤی و وەجێن وی بقەتینت و داخوازا دلۆڤانییێ ژێ دکەت، و تێناتییا دل و دەروونێن خوە، ب ڤیانا خودێ و ب دوعاژێکرنێ دشکێنت و تەنا

دکەت. خودایێ مەزن دبێژت: (( يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ )) (فاطر ١٥). ئانكو: خەلكینۆ باش بزانن، کو هوون هەردەم هەوجەیی خودێنە، و خودایێ مەزن دەولەمەندە و پاکی و منەت ب کەسێ نینە، و بەردەوام سوپاسییا وی دئێتە کرن.

مرۆڤ خوە خودانێ چ بت د ڤێ ژیانێدا، بەرانبەری خودێ، هەردەم ژار و دەستتەنگە، وهەوجەیی دلۆڤانی و سەرەگوهیيا وییە.

هەر مرۆڤەك ل دووف هشیاری و زانینا خوە نێزیکی دلۆڤانییا خودێیە، هەر مرۆڤەك د دەمێ تەنگاڤییێدا، ل خودێ دزڤرت و داخوازا هاریکارییێ ژێ دکەت، هندەك ژ زانایان، ئەڤە ژی کرییە، ئێك ژ بەلگە و نیشانان ل سەر هەبوونا خودێ، کو دیار دکەت مرۆڤی ب سروشتێ خوە بەر ل خودێیە، و هندەك جاران د سەر بێئاگەهییا خوەڕا، زمان شادەییا هندێ بۆ ددەت، ژ ئالییەکی دی ژی ئەڤە هندێ دیار دکەت، کو گەهاندنا هەوارێ بۆ خودێ د دەمێ تەنگاڤییێدا و هێزا وێ یا سەردەست، تشتەکی چاندییە د لەشێ مرۆڤیدا. ل ئێرە تشتێ گرنگ بۆ مرۆڤێ باوەردار ئەوە، کو د خوەشی و نەخوەشییێدا خودێ ژ بیرێ نەچت و هەڤبەندییا وی د گەل خودێ گەرم بت و دوعایێ ژێ بکەت و بەنداتییا خوە بۆ دیار بکەت.

سێ - دوعا: ئەو هەمی پەیڤ و دەستەواژە و دەربڕین و هەستێن دەروونینە، ئەوێن مرۆڤ پێ هەوار و داخوازێن خوە دگەهینتە خودایێ مەزن. و دیارە هندی مرۆڤ زێدەتر و گەرمتر دوعایێ بکەت، پتر دلۆڤانییا خودێ دێ ب دەستڤە ئێت، چونکو ئەڤە نیشانا موکومییا باوەرێ و زێدەپشتڕاستییا وییە ژ خودێ، دیسا ژێدەرێ دلخوەشییا وییە.

چار- تشتێ دوعا بۆ دئێتە کرن: ئەو هەمی پێڤی و وەجن، ئەوێن مرۆڤ ژ خودێ دخوازت کو بۆ بەردەست بکەت و بێهیڤی نەزڤرینت و ب چاڤێ خێرێ بەرێ خوە بدەتێ. مرۆڤ دشێت هەر تشتەکێ ژ خودێ بخوازت - لێ ب هندەك مەرجان کو پاشتر دابێشا وان دێ ئێتە کرن - بلا چەند مەزن و گەلەك بت، چونکو ئەو بەرانبەری مەزناتییا دەستهلات و ملکێ خودایێ مەزن چو نینە.

## گرنگی و جهێ دوعایێ د ئیسلامێدا

ئیسلامێ وەك پەیامەکا ئەسمانی و دینەکی خودایی و گازیکەرێ مرۆڤان بۆ خودێناسی و ئێکتاپەرێسییێ، پووتە و گرنگییەکا گەلەك مەزن داییە دوعاکرن و پاڕپاڕێ، چونکی دوعا نڤێژا دلێن شەپرزە و پێڤییە، هەر وەکی پێغەمبەر (سلاف لێ بن) دبێژت: (( الدعاء مخ العبادة )). ئانكو: دوعا و پاڕپاڕ کاکلکا پەرستنێیە و مرۆڤ ب ڕێکا دوعایێ دگەهتە کووراتییا بەنداتی (العبودیة) و ڤیانا خودایێ بەخشندە و دلۆڤان. (مخ) هەر وەکی د ڤێ فەرمۆدەیێدا هاتی، ئەو پوخ و مەژی و شانەنە ئەوێن د نیڤا هەستییاندا، ل ئێرە دڤێت ئەم هەستییێن پەرستن و خودێناسییێ بناسین، دا بزانین کا بۆ چ دوعا و پاڕپاڕ ب دەورێ پوخ و

مەژی ڕادبت؟ ... زانایێ مەزن (سەعیدێ نوورسی) خودێ ژێ ڕازی بت، بەرسڤا ڤێ پسیارێ ددەت و دبێژت:
((ئەڤ فەرمۆدەیە ژ فەرمۆدەیێن بنسترە، مە فێری هندێ دکەت، کو گەوهەر و کاکلکا **ئیسلامێ** ژ سێ پشك و پەیسکان پێکهاتییە، ئەو ژی ئەڤەنە: پشکا ئێکێ، ئیسلامە ب ڕامانا خوەسپارتنێ، و ئەڤ خوەسپارتنە بۆ خودێ ب (شادەییدان و نڤێژێ و ڕۆژییێ و دانا زەکاتێ و چوونا حەجێ) دیار دبت. پشکا دویێ، باوەرە کو ئەو ژی ژ شەش ستوونێن سەرەکی پێکهاتییە (باوەریئینان ب خودایێ مەزن و ملیاکەت و کتێبێن ئەسمانی و پێغەمبەران و ڕۆژا ئاخرەتێ و ساخبوونا پشتی مرنێ و قەزا و قەدەرێ). پشکا سێیێ، **باشیکرنە** کو پێکهاتییە ژ (قەنجی و بلندی و خوە د سەرڕا دیتنێ یان کرن و ئەنجامدانا هەر کار و کریارەکا جوان و باش). ڤێجا پێدڤییە ئەڤ فەرمۆدەیە سەردەستی هەمی کار و کریار و ڕابوون و ڕوونشتن و ئاستان بت)).

ئەگەر دوعا و پاڕپاڕ (پۆخ و مەژی) یێ پەرستنێ بن، پا هەما (**ئیسلام**) و (**باوەر = ئیمان**) و (**باشیکرن = ئیحسان**) پێکڤە هەستی ب خوەنە، پا ڤێجا پەرستنا خودێ و خوەسپارتن ب بال ویڤە چ ڕامانێ ددەن؟ ئەرێ ڤێ پەرستنێ چ ڕامان هەیە، ئەگەر مرۆڤ ل وێ باوەرێ نەبت، کو خودایێ مەزن زێرەڤانییا هەمی کار و کریارێن مرۆڤی یێن ئاشکەرا و نەپەنی دکەت؟ ئەرێ ئەڤ پەرستنە، هندێ ناگەهینت کو مرۆڤ خودایێ پاك و بلند دئاخێڤت؟ ئەرێ ما تو نابینی کو ئەڤە، ئەنجامدانا کارەکی جوان و باشە، دەمێ مرۆڤێ موسلمان، ب ئینانا ناڤێ خودێ، دەست ب هەر کار و کریارەکێ دکەت؟

## تشتێن مرۆڤ بۆ وان دوعا و پاڕپاڕێ ژ خودێ دکەت

ئەم دشێین بێژین، کو ژ بلی وان هەمی بەر و بەرهەم و پایە و ئاخفتنێن جوانێن دوعا و باوەر ب خوەڤە دگرن، ب ئاوایەکی گشتی، دوعا و پاڕپاڕا مرۆڤی د ڤان سێ تشتاندا دئێتە کورتکرن:

ئێك - بۆ داخوازا لێنەگرتن و لێبۆرینا گونەهان ژ خودایێ مەزن: کەسێ گونەهکار هەوارا خوە دگەهینتە خودێ، دا لێ ببۆرت، و د ناڤبەرا وی و خودێدا بەرپەڕەکی نوو بێتە ڤەکرن و ڤەدان، و ژ چاڤێ دلۆڤانییا خودێ بێبار نەبت.

دیارە مرۆڤ ب سروشتێ خوە، هەردەم بەرهنگاری هندێیە، کو تووشی گونەهـ و بێئاگەهییێ ببت، هەر وەکی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( کل ابن آدم خطـاء، و خیر الخطـائین التوابـون ))، ئانکو: چو مرۆڤ نینن، نەکەڤنە خەلەتییێ، و باشترین مرۆڤێن خەلەتیکەر ئەون، ئەوێن تۆبە دکەن، و ب بال خودێڤە دزڤرن، و پەشێمان دبن، و ل بەر دگەڕن کو ئێدی ل خەلەتی و گونەهێ نەزڤرن. دەمێ ئەم ژ بەر هەر ئەگەرەکێ تووشی گونەهـ و خەلەتییێ دبین، نابت ئەم ژ دلۆڤانی و لێبۆرینا خودێ بێ هیڤی ببین، بەلکو دڤێت هەر وەکی خودایێ مەزن ب خوە ڕێ نیشا مە دایی، ئەم ژ دل داخوازێ ژ خودایێ مەزن بکەین کو ل مە ببۆرت و ل مە نەگرت و بزاڤ و پێکۆلێ بکەین، ب زێدەکرنا قەنجی و باشییان، تۆلا وێ گونەهـ و خەلەتییێ ڤەکەین، خودایێ مەزن د ڤی واریدا دبێژت: (( قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ

اللَّه إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُـورُ الـرَّحِيمُ )) (الزمـر ٥٣). ئـانكو: هـەی (موحەممـەد) بێـژە وان بەندەیێن من، ئەوێن گەلەك د ناڤ خەلەتی و گونەهاندا چوويين، بلا ژ دلۆڤانییا خودێ بێهیڤی نەبن و هـزر نەکەن ئەگەر ب بـال خودێڤـە زڤـڕین و ژیانـا خـوە گوهـۆڕین، خـودێ ل وان نـابۆرت، بـلا پشتڕاسـت بـن، هـەر گاڤەکا ئـەو ژ دل بڕیـارێ بـدەن کـو ب بـال خودێڤـە بزڤـڕن، هنگـێ خـودێ دێ ل هـەمی گونـەهێن وان بـۆرت، چونکی ئەو ب ڕاستی لێبۆر و دلۆڤانە.

د قورئانا پیرۆزدا، خودایێ مەزن، بەرێ مە ددەتە هندێ، کو ئەم داخوازا لێبۆرینا گونـەهان ژ وی بکـەین، هەر وەکی دبێژت: (( ... رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّـا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَـا مَعَ الْـأَبْرَارِ )) (آل عمـران ١٩٣). ئانکو: خودێوۆ، ل گونەهێن مە ببۆرە و دانگێ ل سەر بگرە و مە د گەل وان ڤەنجیکەران بمرینە ئەوێن حـەز ژ تە دکەن، و مە ب بال خوەڤە ڤەگەڕینە.

ئەو هەوجەیی و وەجا مرۆڤ ب ڕێکا دوعا و پاڕپاڕێ دیار دکەت، نیشانا هیڤی و داخواز و پێـدڤییا مرۆڤییـە بۆ ڕاستەڕێکرن و سەرەگوهییێ.

دوو - مرۆڤ ب حوکمێ هندێ کو د ژیانا خوەدا د ناڤ جڤاکەکێدا دژیت، و بۆر و داخوازێن خراب هەنە، و ژینگەهـ و جڤاك تێرا خوە پێپەستێ لێ دکـەن، و شـەیتانەك ژی هەیـە، بـەردەوام ل بـەر دگـەڕت کـو د سـەردا ببەت و ژ ڕێ دەربێخت، ئەڤە هـەمی هنـدێ دگـەهینن، کـو ئـەو پێـدڤی ئاگەهـداری و هشـیارییەکا دورسـتە، و دڤێت داخوازێ ژ خودایێ مەزن بکەت، کو گاڤەکێ ب تنێ ژی پشتا خوە نەدەتێ و ژ چاڤدێری و ڕاستەڕێکرن و سەرەگوهییێ بێبار نەکەت، و هەر ئەڤەیە وە ل پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) کری، کو مە فێری ڤـێ دوعـایێ بکەت و بێژت: (( اللهم لا تكلني إلى نفسي طرفة عين )). ئانکو: خودێوۆ، خوە تەمەت چاڤنەڤاندنەکێ ژی، مـن نەهێلە ب هیڤییا من ب خوەڤە، و من ژ دلۆڤانی و سەرەگوهییا خوە بێبار نەکە.

ئەم ژی د شەڤ و ڕۆژێدا، و د هەر نڤێژەکێـدا، چـەند جارەکـان دبێـژین: (( اهْـدِنَـا الصِّـرَاطَ الْمُسْـتَقِيمَ )) (الفاتحة ٦). ئانکو: خودێوۆ بەرێ مە بدە ڕێکا خوە یا ڕاست، و وە ل مە بکە، هەمی دەمان ئەم بڕیـارێن ڕاسـت و دورست بدەین، و بەرێ مە ژ ڕەفتـار و هەلوێسـتێن نـەباش بێتـە وەرگێـڕان، و ئـەم خـوە د بـەر وێ کریـارێڕا نەکەین، ئەوا د گەل پێناسەیا باوەرداریيا مە و ڕازیبوونا تە نەگونجت. (( ... رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَـةً وَهَيِّـئْ لَنَـا مِنْ أَمْرِنَـا رَشَداً )) (الكهف ١٠). ئانکو: خودێوۆ، ژ کەرەما خوە، دلۆڤانییێ ب سەر مەدە داڕێژە، و مـە د کـار و بارێن مەدە سەرفراز بکە، و وە ل مە بکە، کو بەرێ مە بکەڤتە هەر کریارەکا باشییا دنیا و ئاخرەتێ تێدا بـت..
(( رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَـا مِـنْ لَـدُنْكَ رَحْمَـةً إِنَّـكَ أَنْـتَ الْوَهَّـابُ )) (آل عمـران ٨). ئـانکو: خودێوۆ، دلێ مە گومڕا نەکە، پشتی تە ئەم ڕاستەڕێ کرین، و ژ نـك خـوە دلۆڤـانییێ ب سـەر مـەدە داڕێـژە، ب ڕاستی چو سینۆر و تخووب بۆ دلۆڤانییا تە نینن، و دان، دانا تەیە.

ب ئاوایەکی گشتی داخوازکرنا لێبۆرین و نەرمی و دلۆڤانی و سامان و پایە و سەرکەفتن و دان و ڤیان و لەشساخی و زانستێ و هەر داخوازەکا دی یا مرۆڤی، چ ماددی بت، چ مەعنەوی، سەرباری وان تشتێن د خالا ئێکێ و دوییێدا هاتینە گۆتن، مرۆڤ دشێت ب رێکا دوعایێ بخوازت، و مە گەلەك نموونە ژ ڤان دوعایان ژی، د قورئانێدا هەنە، وەکی: (( ... رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ )) (البقرة ٢٠١). ئانکو: خودێوۆ، د دنیایێ و ئاخرەتێدا، قەنجی و باشییێ بینە رێکا مە، و مە ژ ئێزایا ئاگرێ دۆژەهێ دوور بێخە. (( ... وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْماً )) (طه ١١٤). ئانکو: و بێژە، خودێوۆ زانینا من زێدە بکە.

## مەرجێن دوعا و پاڕپاڕێ

دا دوعا و پاڕپاڕ ل دەڤ خودێ بێتە وەرگرتن، دڤێت پشتی ب ناڤێ خودێ و سوپاسکرنا وی، دەست پێ دئێتە کرن، سلاڤ ل گیانێ پێغەمبەرێ خودێ ژی (سلاڤ لێ بن) بێنە رەوانەکرن، و دڤێت ئەڤ خالێن خوارێ، دەمێ دوعاکرنێ، ل بەر چاڤێن کەسێ دوعاکەر بن:

١- دڤێت دوعا ژ دلێ مرۆڤی دەربکەڤت، نە بەس ب زمانی بت. پشتی ئەم دەستێن خوە ڕابەری خودێ دکەین و ب زمانی دەست ب دوعایێ دکەین، پێدڤییە دلێن مە ژی تێدا پشکداربن.

٢- مە باوەری هەبت کو خودێ مە دەستڤالا نازڤرینت، و دێ دوعایا مە ب جە کەت، هەر وەکی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەکا قودسیدا دبێژت: (( أنا عِنْدَ ظَنِ عَبْدِي بِي )) (بوخاری ڤەگوهازتییە). ئانکو: ئنیەتا بەندەیێ من د گەل من چاوابت، ئەز دێ د گەل وی وەسابم، ڤێجا بلا ئنیەتا مە د ڕاستا خودێدا باش بت و ئەم ل وێ باوەرێ بن، کو ئەو مە دەستڤالا نازڤرینت. هەر وەسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( ادعوا الله وأنتم موقنون بالإجابة )) (هەمی ل سەر ئێکدەنگن). ئانکو: دەمێ هوون دوعایێ ژ خودێ دکەن، ل وێ باوەرێ بن و پشتڕاست بن، کو ئەو دێ وەرگرت و ب جە ئینت.

٣- دڤێت ئەو تشتێ هوون داخواز دکەن، نە دژی یاسایێن بوونەوەری بت، چونکی دوعا پشتەڤانییا گەهشتنا کۆمەکا ئارمانجان دکەت، و قەد جهێ پێکۆل و بزاڤ و خەباتێ ناگرت.

٤- بزاڤ بێتە کرن، کو ئەم خوە بگونجینن د گەل ناڤەرۆکا دوعا و پاڕپاڕێ، ب رێکا پاقژکرنا دلی و خوەدانەپاشێ ژ خوارنا مالێ حەرام و بەدڕەفتاری و خوارنا مافێن خەلکی.

٥- هندەك ژ وان تشتێن تو داخواز دکەی، دڤێت ل دەڤ تە ب خوە هەبن، بۆ نموونە، دەمێ تو داخوازێ دکەی کو خودایێ مەزن ل تە ببۆرت، دڤێت تو ب خوە ژی بەرانبەری کەسێن خەلەتی د دەرهەقێ تەدا کرین، لێنەگر و لێبۆر بی، ما دێ چاوا تشتەکێ ژ خودایێ خوە خوازی، و ئەو تشتە ل دەڤ تە ب خوە نەبت.

٦- نفرینان ل موسلمانان نەکەت، و داخوازێ ژ خودێ نەکەت، کو وان کەرەم و نیعمەتێن د گەل وان کرین، بۆ وان نەهێلت و ژ وان بستینت.

٧- خوە ژ هندەك گونەهان دووربێخت وەكی پشتدانا موسلمانان، و دلهێلان و ئێشاندنا دەيبابان، و ڕاكرنا كەرب و كينان، چونكی گەلەك دەق هەنە، ديار دكەن كو د ڤان ڕەوشاندا، ڕێك ل وەرگرتن و قەبوولكرنا دوعايێ دئێتە گرتن.

٨- دڤێت دوعا ل سەر بنياتا ترسا خودێ و تەماييا كەرەما وی بێتە كرن، و خودايێ مەزن ئەڤە بۆ مە د قورئانا پيرۆزدا دياركرييە دەمێ دبێژت: (( ... وَادْعُوهُ خَوْفاً وَطَمَعاً إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ )) (الأعراف ٥٦). ئانكو: ژ ترسا خودێ و تەماييا دلۆڤانييا وی دوعايێ ژێ بكەن، دلۆڤانييا وی گەلەك نێزيكی وان خوەشمرۆڤانە ئەوێن دوعايێ ژێ دكەن، هەر وەكی خودێ دبێژت: (( ... يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً ... )) (السجدة ١٦).

## ئەو دەم و ڕەوشێن دوعا تێدا دئێتە وەرگرتن

هەر وەكی پێشتر هاتييە دياركرن، دوعا و پاڕپاڕێ چو وەخت و دەمێن دياركری نينن، بەلێ د سەر هندێڕا، هەر وەكی د هندەك فەرمۆدە و ڕاڤەكرنێن هندەك زانايان‌دا هاتی، هندەك دەم و ڕەوش هەنە، دوعا تێدا خوەشتر و چێتر دئێنە وەرگرتن و قەبوولكرن، ژ وان:

١- دوعاكرن پشتی نڤێژێن فەرز.

٢- دوعاكرن د تارييا شەڤێ و بەرسپێدەيێدا.

٣- دوعاكرن د ڕۆژا ئەينييێدا.

٤- دوعاكرنا مرۆڤێ ستەملێكری.

٥- دوعاكرنا دەيبابان بۆ زاڕۆكێن خوە.

٦- دوعاكرنا مرۆڤێ باوەردار بۆ خووشك و برايێن خوە يێن موسلمان، بێ كو وان ئاگەه ژێ هەبت، كو ئەڤە نيشانا دلپاقژی و دلبێشييا وييە بەرانبەری وان.

٧- دوعاكرنا نێزيكی مالا خودێ (كەعبەيێ).

٨- دوعاكرن د دەمێ تەنگاڤی و نەخوەشييان‌دا، نەخاسم دەمێ چو ڕێك ل بەر مرۆڤی نەمينن، ژ بلی خودێ كو هەوارا خوە بگەهينتێ.

## پسیار:

١- ژ بەر چ دڤێت ئەم دوعا و پاڕپاڕێ ژ خودێ بکەین؟

٢- دوعاکرنێ چ کارلێکرن ل سەر دل و دەروون و ژیانا مرۆڤێ باوەردار هەیە؟

٣- وەرگرتن و قەبوولکرنا دوعایێ، ژ بەرێ خودایێ مەزنڤە، چ هەڤبەندی ب ڕەفتار و ژیانا ڕۆژانەیا مرۆڤیڤە هەیە؟

## دان و ستاندن:

ئەگەرێ گرنگیدان و پووتەکرنا زانستێ وەرارکرنا مرۆڤی و دەروونزانییێ چیە ب دوعاکرن و پاڕپاڕێڤە، وەك هۆکار بۆ چارەسەرکرنا نەخوەشییێن دەروونی و هەستکرنا مرۆڤی ب تەناهییا دەروونی؟

### وانەیا شەشێ

## پێك و پایەیا ڕەوشتێ جوان و باش د ئیسلامێدا

ئیسلام دینێ سروشتێ پاك و ساخلەمی و ئەقلێن پێشكەڤتی و دەروونێن پاقژ و بژوونە. ئەگەر ڕەوشتان ژی د هەمی ئایین و دینێن ئەسمانیدا، پێك و پایەیەكا بلند و ب هێز هەبت، د ئیسلامێدا ژی وەسانە، بەلكو زێدەترە ژی، هەتا ئەم دشێین بێژین، ئیسلام پشتی باوەرێ، وەك پەیامەكا ڕەوشتی بەرچاڤە.

ئیسلام هەر ژ هاتنەخوار و سەرێ پەیدابوونا خوە یا ئێكێ، و دژایەتیكرنا بیر و باوەر و بۆچوونێن نەفامێن وی سەردەمی، ب ئاشكەرایی دژمناهییا وان هەمی ڕەوشت و ڕەفتاران كر، ئەوێن ژ وان بیر و باوەر و بۆچوونێن نەفام دەركەڤتین، ئەوێن نەدگونجان د گەل وێ كەرامەت و ڕێز و ڕوومەتێ، ئەوا خودێ ژ بۆ ڕابۆراندنا ژین و ژیارەكا سەرفراز داییە مرۆڤی.

ژ بەر هندێ ڕەوشت د ئیسلامێدا نە تنێ تشتەكی دەستنیشانكرییە ژ تشتان، بەلكو پەیسك و پایەیەكا بنیاتییە د دینیدا، و ڕوحا پەیام و شەریعەتییە، د ناڤ هەمی واراندا، ڕەهێن خوە كوور داقوتایینە.

ئیسلام بەردەوام ل بەر دگەڕت كو گەشاتی و وەرارێ بێختە هەستێ ڕەوشتی ل دەڤ مرۆڤێ موسلمان، دا ژیانەكا تژی ڕەوشت و جوان ڕابۆرینت، چونكی جوانی و كەساتییا مرۆڤی د ڕەوشتێ وی یێ بلنددا بەرچاڤە. ئەوە وە لێ دكەت كو ل دەڤ خودێ و خەلكی و جڤاكێ شرین و خوەشڤی بت.

هەر وەسا ڕەوشتێن جوان، هۆكارەكی گرنگێ پیشكەڤتن و تەناهییا جڤاكینە، و بەدڕەوشتی هۆكارێ تێكدان و ژێكڤەكرن و نەتەناهییا جڤاكانە.

ئیسلام مرۆڤی پال ددەت و دزخینت كو ل دووڤ ڕەوشتێن جوان بچت، و وان دكەتە پیڤكێ دوور و نێزیكاتییێ ژ ڕوحا پەیامێ و پێغەمبەرێ وێ (سلاڤ لێ بن) د ڕۆژا دوماهییێدا. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤی واریدا دبێژت: (( أنّ أقربكم منّي منزلاً يوم القيامة أحاسنكم أخلاقاً الموطأون أكتافاً الذين يألفون ويؤلفون، وأبغضكم إليّ وأبعدكم منّي منزلاً يوم القيامة الثرثارون المتشدقون المتفيقهون )). ئانكو: خوەشڤیترین و نێزیكترین كەس ژ هەوە ڕۆژا دوماهییێ (ئاخرەتێ) ژ من، ئەون ئەوێن د ژیانا دنیایێدا ڕەوشت جوان، و ژ غەیری خوە چێتر ڕەوشت گرتین و ل سەر چوویین.

و بەرانبەری ڤێ، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت، كەسێ ژ هەوە هەمییان پتر د دلێ مندا نەچت، و كەربێن من ژێڤە دبن، و ژ هەمییان زێدەتر دووری من ڕۆژا ئاخرەتێ، مرۆڤێن پڕبێژ و خوەمەزنكەرن، ئەوێن هزر دكەن كو ڕێكا ڕازیكرنا خەلكی و تێركرنا هەست و نەستێن وان، سالووسی و مەلاقی و زمانحولییاتییە، خوە تێناگەهینن كو ڕەوشت، ڕەفتار و كریارن، و خراب كارئینانا زمانی ژی، ئێك ژ ڕەوشت و ڕەفتارێن كرێت و زێدەنزمە.

ئیسلام د قورئانا پیرۆزدا، بانگ و گازییا خوە بۆ ڕەوشتێن بلند هلددێرت، و باوەرداران و سەرانسەری خەلکی پال ددەت، کو ڕێکا باشی و قەنجییێ بگرن و خوە ژ هەمی خرابی و ڕەوشتێن کرێت و کریارێن نە د ڕێدا بدەنە پاش و ژێ دوور بکەڤن، هەر وەکی خودایێ مەزن دبێژت: (( إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ )) (النحل ٩٠). ئانکو: خودێ فەرمانێ ب دادپەروەری و قەنجیکارییێ دکەت و خرابی و گونەهـ و ڕەفتارێن کرێت و نە د ڕێدا و زۆرداری و نەهەقییێ حەرام دکەت و بەرێ مە ژ بێئاگەه نەبوونێ وەردگێڕت و مە د بەر جهێنانا ئەرکانڕا دکەت.

ئیسلام ڕەوشتی دکەتە کێلکا وان هەمی ئارمانجان، ئەوێن پێدڤییە هەمی موسلمان هەڤڕکی و بەڕەبەزینێ بۆ بکەن، و ڕەوشتجوانی کرییە پایە و پەیسکەکا باوەرداری و ئایینی، کو ڕێز و ڕوومەتا خودانێ خوە، ل دەڤ خودێ مەزن دکەت. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( أكملكم إيماناً أحاسنكم أخلاقاً )) ئانکو: ئەوێ ژ هەوە هەمییان ڕەوشت تەکووزتر، ژ هەوە هەمییان ڕەوشتجوانترە. بەلکو ب ڕێکا هوورك بەرێخوەدانا هندەك فەرمۆدەیێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بۆ مە دیار دبت، کو ڕەوشتباشی ل دەڤ خودێ ژ وێ پەرستنێ گەلەك باشتر و ب ڕێزترە، ئەوا خودانێ خوە د بەر ڕەفتار و ڕەوشتێ جوانڕا نەکەت. هەر وەکی د فەرمۆدەیەکا دیدا هاتی: (( ان العبد ليبلغ بحسن خلقه عظيم درجات الآخرة و شرف المنازل و أنه لضعيف العبادة ، و إنه ليبلغ بسوء خلقه أسفل درجة في جهنم )) (ئەبوو داود ڤەگوهازتییە). ئانکو: ئەگەر خودێپەرێسییا مرۆڤی - پشتی جهێنانا فەرزان - گەلەك ژی نەبت، مرۆڤ دشێت پایە و پەیسکەکا مەزن ڕۆژا ئاخرەتێ، ب ڕێکا ڕەفتار و ڕەوشتێن بلند، ب دەست خوەڤە بینت. دوور نینە، د هەمان دەمیدا، ژ بەر بەدڕەوشتییێ، بەرێ وی بکەڤتە دۆژەهێ ژی، ئەڤە د ئیسلامێدا تشتەکی گەلەك ئاسایی و سروشتییە، چونکی ئێك ژ بەر و بەرهەمێن شرینێن پەرستنێ، و بەلگە و نیشانا باش جهێنانا وان، و تێکلبوونا وان د گەل دل و دەروونێ مرۆڤی، پێگیرییا مرۆڤێن باوەرداره، ب ڕەفتار و ڕەوشتێن باش و جوان. بۆ نموونە خودایێ مەزن ل دۆر کارلێکرنا نڤێژێ ل سەر ڕەوشتێ مرۆڤێ باوەردار دبێژت: (( ... إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ... )) (العنكبوت ٤٥). ئانکو: نڤێژ بەرێ خودانێ خوە ژ هەمی کار و کریارێن خراب و کرێت و نە د ڕێدا وەردگێڕت.

ژ وێ باوەرێ، کو ڕەوشت ڕەنگێ خوە ددەتە سەرەدەری و تێکلییا مرۆڤی د گەل خەلکی، لەو ب ئاوایەکی گشتی، دیتن و بەرێخوەدانا خەلکی ل دۆر کەسەکێ، هلسەنگاندنا ڕەوشتێ وییە، و د هندەك فەرمۆدەیێن پێغەمبەری دا ژی هاتییە، کو دیتن و بەرێخوەدانا خەلکی و هلسەنگاندنا وی ژ ئالییێ ڕەوشتیڤە، جە و پایە و پەیسکا وی کەسی ل دەڤ خودایێ مەزن دەستنیشان دکەت. د ڤی واریدا، ژ کیسێ پێغەمبەری هاتییە ڤەگوهازتن: (( ان النبي (ﷺ) كان ذات يوم جالساً مع أصحابه ، فمرت جنازة أثنى الحاضرون على صاحبها خيراً فقال النبي(ﷺ): وجبت، و سكت ثم مرت جنازة أخرى فقال الحاضرون عن صاحبها شراً فقال النبي (ﷺ): وجبت، فسأله أصحابه عن معنى قوله وجبت في الحالتين المختلفتين، فقال:(( أمّا الأول فأثنيتم عليه خيراً فوجبت

له الجنة، وأمّا الثاني فقلتم عنه شراً فوجبت له النار)) (ترمذي ڤەگوهازتییه). ئانكو: ڕۆژەكێ پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ناڤ هەڤال و هۆگرێن خوەدا ڕوونشتی بوو، تەرمێ مرییەكێ د بەر وانڕا بۆری و هەڤالێن وی گەلەك ب باشی بەحسێ وی مری كرن، ئینا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: هاتە وەرگرتن یان مسۆگەر بوو، و بێدەنگ بوو. پاشێ تەرمێ مرییەكی دی د بەر وانڕا بۆری، هەڤالێن وی گەلەك ب نەباشی بەحسێ وی كرن، دیسا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: هاتە وەرگرتن یان مسۆگەر بوو، ئینا هەڤال و هۆگرێن وی پسیار ژێ كرن كا ڕامانا (وجبت) هاتە وەرگرتن یان ڤەبڕین، د هەردو ڕەوشاندا چیە؟ ئینا وی ژی د بەرسڤا واندا گۆت: هندی تەرمێ ئێكێ بوو، هەوە ب باشی ناڤێ وی ئینا و بەحسێ وی كر، بەهەشت بۆ مسۆگەر بوو، و هندی یێ دویێ بوو هەوە ب نەباشی ناڤێ وی ئینا و بەحسێ وی كر، بارا وی بوو دۆژەه و ئاگر.

ئەڤە ژی وێ ڕامانێ ددەت، كو ڕازیبوونا خەلكی ژ كەسەكێ، بەلگە و نیشانە ل سەر ڕەوشت باشییا وی، كو ئەڤە ژی - د گەل باوەرییئینانا وی ب خودێ -دێ بنە ئەگەرێ ب دەستڤەئینانا ڕازیبوونا خودێ، و ئەنجاما نە ڕازیبوونا وان ژی بەرەڤاژی ڤێ چەندێیە.

و باوەرداران ژی وەسا تێ دگەهینت، و بەرێ وان ددەتە هندێ، كو قەنجیكاری و خێرخوازییێ هەڤبەندی ب هندەك تشتێن سەرڤەسەرڤە و پێشچاڤڤە نینە، بەلكو ناڤ و نیشانە بۆ هەر كریارەكا قەنج و جوان، ئەوا ژ هەستەكی ڕەوشتی یێ پاقژ و دلەكی تژی ژ ڕۆناهییا باوەرێ و ڤیانا خودێ و خەلكی دەردكەڤت. هەر وەكی خودایێ مەزن دبێژت: (( لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ )) (البقرة ١٧٧). ئانكو: قەنجیكاری ئەو نینە ئەم بەرێ خوە بدەینە ڕۆژهلاتێ یان ڕۆژئاڤایێ، بەلكو قەنجیكاری ئەوە، باوەرداران باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ و كتێبێن ئەسمانی و پێغەمبەران هەبت، و ژ مالێ خوە، ئەوێ ل بەر دلێ وان شرین، بارا لێزم و نێزیكێن خوە و سێوی و پێڤی و ڕێڤینك - ئەوێن ژ وەلاتێ خوە دووركەڤتین، خوە دەولەمەند ژی بن - و داخوازكەر و وان بەندەیان تێ بێخن، ئەوێن ل بەر، كو ئازادییا خوە بەرانبەری مال و پارەیی بكڕن، هەر وەسا نڤێژان بكەن و زەكاتێ بدەن و سۆز و پەیمانێن خوە ب جە بینن، و بێنا خوە ل سەر نەخوەشی و تەنگاڤییان فرەه بكەن، و د جەنگ و جیهادێدا نەڕەڤن، ب ڕاستی ئەها ئەڤەنە مرۆڤێن ڕاستگۆ و ئەڤەنە پارێزكار و خودێترسێن ڕاستانی.

## پسيار:

١- ژ بەر چ پايە و پەيسكا ڕەوشتان د ئيسلامێدا بلندە؟ و ڕۆژا ئاخرەتێ، ئەگەرێ گرانييا وان د تەرازوويا قەنجى و باشييێن باوەرداراندا چيە؟

٢- لاوازى و بێخێرييا ڕەوشتى، د گەل جهێينانا نڤێژ و ڕۆژييێن سەرڤەسەرڤە و هندەك پەرستنێن دى يێن پێشچاڤ، چ ڕامانێ ددەت؟

## دان و ستاندن:

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) هاتە هنارتن، دا ڕەوشتێن جوان و هەژى تەكووز و كامل بكەت. ڤێ چەندێ ڕۆن و ئاشكەرا بكە.

## وانەیا حەفتێ

### پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) سەرمەشقێ مەزنێ ڕەوشتباشی و قەنجیخوازییێ

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) مەزنترین سەرمەشقە بۆ باوەردار و سەرانسەری ڕەوشتدۆستان. قورئان د ڕاستا ویدا دبێژت: (( لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً )) (الأحزاب ٢١). ئانكو: پێغەمبەر بۆ هەوە سەرمەشقەکی باش و سەرکێشە، خێرخوازە بۆ وان هەمی کەسێن باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ دئینن و چاڤێ وان ل هیڤییا خەلاتێ خودێیە و خودێ گەلەك دئینە بیرا خوە.

ل دووف تێکستێ قورئانێ، و ڕاستییا ژیاننامەیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ب خوە ژی، پێغەمبەر سەرمەشقەکی باش و بەراهیکێشە بۆ باوەرداران و سەرانسەری مرۆڤاتییێ.

ژیانا ڕۆژانەیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و سەرەدەری و ڕابوون و ڕوونشتنا وی د ناڤ بنەمالا خوە و جڤاکێدا و د گەل هەڤال و هۆگر و دژمنێن خوە ب گشتی، وێ چەندێ بۆ مە دیار دکەن، کو وی هەمی دەمان ل دووف بنەمایێن ڕەوشتێن باش و بلند سەرەدەری د گەل وان کرییە، ب کار و کریار ناڤەڕۆکا ئیسلامێ ب ڕێکا ژیانا خوە ب ئاوایەکی وەسا بەرجەستە و بەرچاڤ کرییە، کو ئەم دشێین بێژین ئەو وەکی قورئانەکا ساخ و زێندی بوو د ناڤ خەلکیدا. هەر ژ بەر هندێ بوو، دەمێ دەرهەقێ ڕەوشتێ وی پسیار ژ هەڤسەرا وی عائیشایێ هاتییە کرن، بەرسڤ دا و گۆت: (( كان خلقه القرآن )). ئانکو: ڕەوشتێ وی قورئان بوو، ئانکو بەرجەستەکرنا ناڤەڕۆکا قورئانێ بوو. ڕەوشتێ بلندێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بەلگە و نیشانەکا ب هێزە ل سەر ڕاست پێغەمبەراتییا وی، خودایێ مەزن ژی د قورئانا پیرۆزدا، شادەییا ڤێ ڕەوشتبلندییێ بۆ ددەت و د ڕاستێدا دبێژت: (( وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ )) (القلم ٤). ئانکو: هەی موحەممەد، ب ڕاستی تو خودان ڕەوشتەکی گەلەك مەزنی.

د ڤێ ئایەتێدا و د هندەك ئایەتێن پشتی ڤێدا، بۆ مە دیار دبت کو کێشفەکێش و نەلێکیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) د گەل دژمنێن هەڤپشکچێکەر و بێباوەرێن سەردەمێ خوە، نەلێکی بوو د ناڤبەرا دو جوونێن ڕەوشتاندا، ڕەوشتێ باوەر و پێغەمبەراتییێ، د گەل ڕەوشتێ بێباوەری و هەڤپشکچێکرن (شرك) و نەفامییێ. هەر وەسا ڕۆن و ئاشکەرا دبت، کو جەنگا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) باراپتر جەنگ و جیهادەکا ڕەوشتی بوو.

و ژ ڤێ ئێکێ ژی، پێغەمبەری پەیام و ئەرکێ پێغەمبەراتییا خوە، وەسا ددا دیارکرن، کو ژ بۆ تەکووزکرن و تەمامکرنا ڕەوشتێن پاقژ و بلند هاتییە: (( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق )). ل ڤێرێ ژی، فەرە ئیشارەت بۆ هندێ بێتە کرن، کو (مكارم الأخلاق) نە تنێ بەحسێ هندەك ڕەوشتێن جڤاکی یێن ئاسایییە، بەلکو د ناڤەڕۆکا خوەدا، ئیشارەتە بۆ وان هەمی بها و بنەمایان، ئەوێن کەرامەتا مرۆڤی دپارێزن.

هەر ژ بەر هندێ، خودایێ مەزن ب خوە، پێغەمبەر بەرهەڤ كربوو، و د بن زێرەڤانی و چاڤدێرییا وی ب خوەدا، بووبوو نموونەیێ سەرمەشق و كەساتییەكا مەزن بۆ هەمی مرۆڤاتییێ ب گشتی و بۆ هەڤال و هۆگر و دووكەڤتی و حەژێكەرێن خوە ب تایبەتی.

هەر د چارچۆڤێ رێ و نیشانێن خودایێ مەزندا، بۆ بەرهەڤكرنا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بۆ سەرمەشقی و ئەركێ پێ هاتییە سپارتن، قورئان ڕووباری وی دبێژت: (( خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ )) (الأعراف ١٩٩). ئانكو: چاڤێن خوە ژ خەلەتی و كێماسییێن خەلكی بگرە، (بۆ نموونە سەرا وان كەس و كار و دۆستان بدە، ئەوێن رێكا خوە ژ مالا تە گرتین و سەرا تە نادن، و ل وان كەسان ببۆرە ئەوێن زۆرداری و ستەمكارییێ ل تە دكەن). مافێ تەیە، د دۆز و مەسەلەیێن خوە یێن كەساتیدا مافێ خوە ژ وان كەسان بستینی، ئەوێن نەهەقی ل تە كرین. داخوازا قەنجییێ بكە و ڕوویێ خوە ژ كەسێن نەفام و نەزان وەرگێڕە و پووتە ب وان نەكە، جرەبڕ و كێشەكێشێ د گەل وان نەكە و خوە نەئینە ڕێزا وان.

لێبۆرین ئێك ژ گرنگترین ڕەوشتێن باش و بلندێن پێغەمبەری بوو (سلاڤ لێ بن)، و ئەڤە ژ وان ڕەوشتباشییانە، ئەوێن كو ئەم دشێین تێدا چاڤ ل سەركێش و ڕێبەرێ ڕەوشتدۆستێ خوە یێ مەزن، پێغەمبەری بكەین، و پێ خوە ب خێرخوازییێ بخەملینین، و ژیانەكا تەنا و بەختەوەر ڕابۆرینین و دەرباز بكەین. و ل ڤێرێ فەرە ل سەر هەر باوەردارەكێ، ژیاننامەیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بخوونت و ڤەكۆلت، چونكی هندی ئەم باشتر و كوورتر د ژیاننامەیا ویدا شارەزا بین و ڕەفتار و ڕەوشتێن وی یێن بلند بنیاسین، كارلێكرنا وان ل سەر مە دێ پتر بت و دێ شێین پتر و زێدەتر مفایی ژ سەرمەشقییا وی وەربگرین، و ژ ئالییێ ڕەوشتیڤە، بەر ب بلندایی و گەهشتن و وەرارەكا زێدەتر بچین. و ئەڤە ژی دێ بتە ڕەنگڤەدانا وێ ئایەتا قورئانێ ئەوا د ڕاستا پێغەمبەریدا (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ )) (الانبياء ١٠٧). ئانكو: مە تو ب هندێ یێ هنارتی و ڕەوانەكری، دا ببییە ژێدەر و سەرەكانییا دلۆڤانی و دلپێڤەیییێ بۆ هەمی جیهانان.

ئەو نە تنێ د گەل پشتەڤان و دووكەڤتییێن خوە سینگفرەهـ و لێبۆر بوو، بەلكو د گەل دووكەڤتییێن ئایینێن دی و هەمی مرۆڤان ب گشتی، هەمان سەرەدەری كرییە، و بەردەوام داخوازا یەكسانییێ دكر و پێكۆل دكر خەلكی وەسا تێ بگەهینت كو پێكڤە دووندەها دایك و بابەكێنە، و ژێدەرێ پەیدابوونا وان ئێكە، ژ بەر هندێ دڤێت ب گیانێ براتی و لێبۆرینێ سەرەدەرییێ د گەل ئێكدو بكەن، و هەر ژ بەر هندێ، د گۆتارێ حەجا خاترخواستنێدا، ب ڤی ئاوایی هەڤال و هۆگرێن خوە ئاخاڤتن: (( أيها الناس من كنت أخذت له مالاً فهذا مالي فليأخذ منه، ومن كنت ضربت له ظهراً فهذا ظهري فليضربه، أيها الناس كلكم لآدم و آدم من تراب لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأعجمي على عربي الاّ بالتقوى )). ئانكو: گەلی مرۆڤان، هەر كەسەكێ من مال و سامانەك ژێ ستاندبت، ئەڤە مالێ منە، بلا بێت مافێ خوە ژێ ڕابكەت، و هەر كەسەكێ من قامچییەك ل پشتێ دابت، ئەڤە

پشتا من ل بەرە، بلا بێت تۆلا خوە ژ من ڤەکەت، گەلی مرۆڤان، هوون هەمی ژ ئادەمینە و ئادەم ژ ئاخێ هاتییە چێکرن، نە کەسێ عەرەب ژ غەیری خوە چێترە، و نە کەسێ غەیری عەرەب ژ یێ عەرەب چێترە، ئانکو کەس ژ کەسێ چێتر نینە و چێتری تنێ ب تەقواداری و پارێزکارییا خودێیە.

**پسیار:**

ژ بەر چ خودایێ مەزن دبێژتە پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) تو خودان ڕەوشتەکی پاقژ و بلندی؟

**دان و ستاندن:**

سەرمەشقی و پێشەنگییا پێغەمبەری، ژ ئالییێ ڕەوشتیڤە، بۆ موسلمانان چ ڕامانێ ددەت؟

## وانەیا هەشتێ

## هندەك ژ سالۆخەتێن ڕەوشتی د ئیسلامێدا

د ئیسلامێدا، ڕەوشتی چەند تایبەتمەندی و سالۆخەتێن تایبەت هەنە ژ وان:

### ١- هەڤبەندبیا ڕەوشتی ب بیر و باوەریڤە :

د ئیسلامێدا، بیر و باوەر ئەو هێزە، ئەوا وە ل باوەرداران دکەت، کو خوە ب ڕەوشت و ڕەفتارێن جوان بخەملینن، و ژ ڕەوشتێن کرێت و نزم خوە دوور بێخن، و د ژیانا خوەدا، پێگیرییێ ب وان هەمی ڕەفتارێن جوان بکەن، ئەوێن ستوون و بنەمایێن ڕەوشتبلندییێ دخوازن، خودایێ مەزن ژی، سۆز داییە کو هەر کەسەکێ پێگیرییێ ب ئاکار و ڕەوشتێن جوان بکەت، و کار و کریارێن باش بکەت، خەلاتێ وی بکەتە بەهەشت، خودایێ مەزن دبێژت: (( **مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ** )) **(النحل ٩٧)**. ئانکو: هەر کەسێ ژ هەردو ڕەگەزان (چ نێر، چ مێ) قەنجیکار و باوەردار بت، ئەم دێ وەك خەلات، د دنیاییێدا، ژین و ژیارا وی خوەش کەین، و د قیامەتێدا ژی، ل دووڤ باشترین کریارا وی، دیسا دێ وی خەلات کەین.

ئەڤە ژی د پێکڤەگرێدانا ئایین و ڕەوشتجوانییێدا، ئەوا د قورئان و فەرمۆدەیێن پێغەمبەریدا (سلاڤ لێ بن) ب جوانی دیار دبت، گەلەك ئایەت د قورئانێدا ئیشارەتێ بۆ وێ هەڤبەندبیا موکوم دکەن، ئەوا د ناڤبەرا باوەرێ و کریارا قەنج و ڕەوشتێ باشدا، و دیار دکەت، کو باوەر مرۆڤی ژ خرابی و ڕەوشتنزمییێ دپارێزت. دەمێ قورئان داخوازێ ژ باوەرداران دکەت، کو پێگیرییێ ب ڕەوشت و ئاکارێن جوان بکەن، هزر و بیرا وان ل سەر هندێ خوەجه دکەت، کو ئەو باوەردارن، و ئەڤە پێدڤی و هەلوێستەکی فەرە ل سەر وان. ڤێجا ئەگەر باوەر دارەکا بەری بت، ئێك ژ بەرێن وێ یێن شرین، قەنجیخوازی و ڕەوشتبلندییە.

دەمێ ئەم هزرا خوە د سەرێ سۆرەتا (المؤمنون) دا دکەین، دبینین، بەحسێ کۆمەکا کار و کریارێن قەنج و ڕەوشتێن بلند دکەت، کو ئەو بەر و بەرهەمێ باوەرێنە و باوەردارێن ڕاستانی و دورست پێ دئێنە ناسکرن: ((**قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١﴾** )) (المؤمنون ١ - ١١). ئانکو: ب ڕاستی سەرکەڤتی و سەرفرازبوون، ئەو باوەردارێن کو ئەڤ سالۆخەتێن خوارێ ل دەڤ هەبن:

١- ئەوێن نڤێژێن خوە ب گوهداری و خوەشکاندن دکەن.

٢- ئەوێن گوهـ نەدەنە پڕبێژی و ئاخفتنێن پووچ و نزم و بێ ئارمانج و پشتا خوە ددەنێ.

٣- ئەوێن زەکاتا مالێ خوە ددەن.

٤- ئەوێن دانگ و دەهمەنێن خوە ژ پووچییان دپارێزن و دەهمەنپاقژن، و هەڤبەندییا سکسی تنێ د گەل هەڤسەرێن خوە یێن شەرعی دکەن، چونکی کەسێن د سەر دەستێ خوەدا دچن و زنایێ دکەن، ددەنە سەر پەژانێ خودێ و دەستدرێژییێ دکەن.

٥- هەر وەسا ئەوێن دەستپاقژێن سۆز و پەیمانێن خوە ب جە دئینن.

٦- ئەوێن نڤێژێن خوە ل وەخت دکەن و د کرنا واندا تەرکەخەم نەبن و نەهێلن.

٧- هەر باوەردارەکێ ئەڤ سالۆخەتە ل دەڤ هەبن، دێ ب (فیردەوس)ێ شابت، کو بلندترین وخوەشترین جهە د بەهەشتێدا، و هەتاهەتا دێ تێدا نەمر و زێندی بت.

هەر وەسا خودێ د قورئانا پیرۆزدا دبێژت: (( **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ** )) (الحجرات ٦). ئانکو: گەلی باوەرداران، ئەگەر ئاخفتنەك ژ خرابەکارەکێ گەهشتە هەوە، یان هاتە ڤەگوهازتن، ئێکسەر باوەر نەکەن، و ل دووڤ هەڕن و ڤەکۆلن، کا ڕاستە یان درەوە، دا هوون نەکەڤنە د خەلەتییێدا و چو بڕیارێن نەدورست نەدەن.

لەو گرنگترین هۆکارێ لاوازی و بێخێرییا ڕەوشتی د ناڤ جڤاکا موسلماندا، لاوازی و بێخێرییا باوەرێ یان نەبوونا وێیە، و کێمبوونا کارلێکرنا وانە ل سەر ڕاستەڕێکرنا ژیانا مرۆڤان. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( **لا إيمان لمن لا أمانة له ولا دين لمن لا عهد له** )) (ئیمام ئەحمەد ڤەگوهازتییە). ئانکو: ئەوێ ئەمانەتێ نەپارێزت، باوەرییا وی نەدورستە یان بێباوەرە، و ئەوێ پەیمانشکێن و بێسۆزبت ژی، دینێ وی نەدورستە. ئانکو د ڤان هەلوێستاندا، سالۆخەتێن مرۆڤێن دیندار لێ دیار نابن. هەر وەسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( **من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذ جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت** )) (بوخاری ڤەگوهازتییە). ئانکو: کەسێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەبت، بلا قەدرێ جیرانێ خوە بگرت، و ئەوێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەبت، بلا قەدرێ مێڤانێ خوە بگرت، و ئەوێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەبت، بلا جیرانێ خوە نەئێشینت، و ئەوێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەبت، ئەگەر ئاخفت، بلا ب قەنجی باخفت یان ژی خوە بێدەنگ بکەت.

ئەڤا بۆری هەمی هندێ دگەهینت، کو ڕەوشتجوانی پێڤکەکی سەرەکی و بنیاتییە بۆ باوەردارییێ، ئانکو ئاستێ باوەرداری و ڕاستگۆییا مرۆڤی، ب ڕەوشتجوانی و سەرەدەرییا وی دئێتە هلسەنگاندن. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤی واریدا دبێژت: (( **أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم اخلاقاً** )) (ترمذی ڤەگوهازتییە). ئانکو: باوەردارێ ژ هەمییان باوەرتەکووزتر، ئەوە یێ ژ هەمییان ڕەوشتجوانتر. چونکی، باوەرییئینان نە ب مەلاقی و سالووسی و هیڤیخوازتنێیە، بەلکو هەر وەکی هاتییە گۆتن: ڕاستییەکە جهێ خوە د دل و دەروونان‌دا دکەت، و

ڕهێن خوه تێدا كوور دادقوتت، و زمان شادهیییێ بۆ ددەت و ڕازیبوونا خوه ل سەر دیار دكەت، و كار و كریارێن باش، ئەوێن مرۆڤێ باوەردار ب جه دئینت، بۆ دبنه بەلگه و نیشان.

## پسیار:

١- تو چاوا د وێ هەڤبەندیێ دگەهی، ئەوا د ناڤبەرا ڕەوشتان و مرۆڤێ موسلماندا؟

٢- ئەرێ باوەرێ چ كارلێكرن ل سەر ڕەوشتێ مرۆڤێ موسلمان هەیە؟

## دان و ستاندن:

ژ بەر چ هندەك كەس هەر چەندە باوەردارن ژی، لێ ڕەوشتێ وان ژ هندەك ئالییانڤە نە ل دووڤ باوەرا وانە، ئانكو نە ڕەنگڤەدانا وێ باوەرێیە؟

## وانەیا نەهێ

# هۆکارێن پەروەردەکرنا ڕەوشتی

پەروەردەکرنا ڕەوشتی د ئیسلامێدا، هۆکارێن خوە یێن جوداجودا هەنە، کو ب ئاوایەکی پۆزەتیڤانە کارلێکرنا خوە ل سەر پەروەردەیا تەکمرۆڤی و جڤاکێ دکەن. دا بزانین کا ڕامانا پەروەردەیا ڕەوشتی و گرنگی و هۆکارێن وێ چنە؟

## ڕامانا پەروەردەیا رشەوشتی

پەروەردەیا ڕەوشتی د ئیسلامێدا، ئەوە کار ژ بۆ پەیداکرنا ڕەوشتێن باوەرێ د دەروونێ باوەرداراندا بێتە کرن، و نەمازە ل دەڤ دەستەکا خۆرت و لاوان. سەخمەراتی ڕاستکرنا ڕەفتار و پاقژکرن و پارستنا وان ژ ڤارێبوون و تەحسین و دوورئێخستنا وان ژ ڕەوشتێن کرێت و چاندنا توۆڤێ خودێترسییێ د دل و دەروونێ واندا. چاندن و شینکرنا ڕەوشتێن جوان ژی، ب ڕێکا چەند ئەگەرەکان پەیدا دبت، وەکی: سەرمەشقێ باش، فێرکرن و سەرەگوهییا ئێکسەر، خودێپەرێسی و شیرەتکرن، ڕاستەڕێکرن و نیشادان، ترساندن و ب هیڤیخستنێ **(الترغیب والترهیب)**.

## گرنگییا پەروەردەیا ڕەوشتی

گرنگییا پەروەردەیا ئیسلامی د هندێڕایە، کو ڕەوشتێن ئیسلامی ب تەکمرۆڤان ددەتە ناسین و وان بەرهەڤ دکەت، دا ئەو ڕەوشت و تشتێ ئەو فێربوویین د ژیانا خوەدا ب جە بینن، و ل کریار و ڕەفتار و ڕابوون و ڕوونشتنێن وان یێن ڕۆژانە دیار ببت. ئانکو کارێ پەروەردەیا ڕەوشتی دکەت ئەوە کو ڕەوشت و باشییێ د ناڤ جڤاکێدا بەلاڤ بکەت و خەلکی د ڕوویێ ڕەوشتێن کرێت و نە د ڕێدا هشیار بکەت، دا بشێن ڕابوون و ڕوونشتنا خوە ب ئاوایەکێ بگوهۆڕن، کو د گەل ڕێ و نیشانێن پەروەردگاری و ڕەوشتێن بلند بگونجن، و مرۆڤ د تێکلی و سەردەرییا خوەدا بنەمایێن ڕەوشتێن جوان بەرچاڤ وەربگرت و ب جە بینت، وەکی دادپەروەرییێ، چاکخوازییێ، چاڤژێگرتن و لێبۆرینێ و درێژکرنا دەستێ هاریکارییێ و دلۆڤانی و سینگفرەهییێ و .... هتد.

## شێوازێن پەروەردەیا ڕەوشتی

پەروەردەیا ڕەوشتی د چاڤ و دیتنا ئیسلامێدا، ب ڕێکا گەلەك ئالاڤان دئێتە جهێنان، ژ وان:

**سەرمەشقێ قەنج (القدوة الصالحة)**: پەروەردەکرن ب ڕێکا سەرمەشقێ قەنج، ژ هەمی هۆکارێن پەروەردەکرنا ڕەوشتان کارلێکەرترە، ژ بەر هندێ، ئیسلامێ گەلەك پووتە و گرنگی داییە ڤی هۆکاری، خودایێ مەزن دبێژت: (( لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا )) (الأحزاب ٢١). ئانکو: پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) سەرمەشقەکی باش و بەردەستە، بۆ هەر کەسەکێ هیڤییا خوە ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ گرێدایی، و گەلەك خودێ ئینایییە بیرا خوە و ژ بیر نەکری.

ژ بەر هندێ، پێدڤییە ل سەر کەسێن پەروەردەیا ڕەوشتی نیشا غەیری خوە ددەن، پێکۆل و بزاڤێ بکە نکو ئەو ب خوە د وی واریدا باشترین نموونە و پێشەنگ بن، و شوونوارێن هەر تشتەکی ئەو بانگ و گازییێ بۆ هلددێرن، ب ژیان و ڕەفتارێن وانڤە دیاربت. ژ ئەرکێ هەر باوەردارەکێیە، چ برا، خوشك، باب، مامۆستا، کار ب دەست و خودان هەر پیشەیەك بت، ژ بلی وارێ ئیسلامییێ گشتی، دڤێت وەك موسلمان د وارێ خوە ب خوە ژیدا، نیشانا پاقژی و دلبێشی و پێشەنگییێ بت، نە ب ئاخفتنێ، بەلکو ب کار و کریاران، دڤێت خەلەتی و نەڕاستییێن ڕەوشتی بۆ غەیری خوە ڕاست بکەت، ئەگەر هەر ئێك ژ مە ڤوتابییێ بەردەستی غەیری خوە بت، و تشتێن باش ژێ وەربگرت و فێر ببت، هندەك دێ هەبن، کو چاڤ ل مە ژی بکەن و تشتی ژ مە ژی وەربگرن و فێر ببن.

و ئەم وەك خۆرت و گەنجێن موسلمانێن باوەردار و هشیار و خودان پەیام، نابت ئەم ڕێکێ بدەینە خوە، کو خەلك تشتەکی وەسا ژ مە بگرت و فێر ببت، د گەل بنەمایێن ئیسلامێ و بهاڕەوشتییێن جوان نەگونجت، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( کلکم راع، وکلکم مسؤول عن رعیته ))، ئانکو: هەر ئێك ژ هەوە ژ وان کەسان بەرپسیارە ئەوێن تشتی ژێ وەردگرن و چاڤ لێ دکەن. هەر وەسا دبێژت: (( من سنّ سُنَّةً حسنةً، فله أجرها وأجرُ مَنْ عَمِلَ بها، من غیر ان ینقصَ من اجورهم شيءٌ، ومن سنّ سُنَّةً سیَّئةً کانَ علیه وزرها ومثل وزرِ مَنْ عَمِلَ بِها مِنْ غَیْرِ أن یَنقُصَ منْ أوزارِهِمْ شيء )). ئانکو: هەر کەسەکێ د چارچۆڤێ ئیسلامێدا، ڕێك و ڕێبازەکا باش پەیدا بکەت، خەلاتێ وێ ڕێك و ڕێبازێ و یێ کەسێ ل سەر بچت و پێ بکەت ژێ دێ گەهتێ، و بەرەڤاژی ڤێ چەندێ ژی، هەر کەسەکێ ڕێك و ڕێبازەکا خراب ژی پەیدا بکەت و نیشا غەیری خوە ژی بدەت، و گەلەك بکەڤنە د بن کارلێکرنا خرابییا وێدە، ئەها گونەها وی و یا هەر کەسەکێ بکەت و ل سەر بچت ژی، دێ کەڤتە ستوییێ وی.

ژ بەر هندێ، دڤێت خۆرتێ باوەردار، هەر ژ دەستپێکا خۆرتینییا خوە، خوە وەسا پەروەردە بکەت، کو نە تنێ نموونەیێ ڕەفتار و ڕەوشتێن باش بت، بەلکو د ڤی واریدا، کارلێکرنا خوە ل سەر دەور و بەرێ خوە ژی هەبت و ببتە هیمایێ ڤەنجیخوازی و دلۆڤانی و خزمەت و جانفیدایی و ڤیانێ بۆ کەسێن دی ژی.

ژ بۆ کو مرۆڤ د ڤی واریدا سەرفراز و سەرکەڤتی ژی بت، هلبژارتنا هەڤالێن هەمیشەیی ژی گرنگ و فەرە. دڤێت هەڤالینییا وان کەسان بکەت، و نهێنییێن خوە بۆ وان دەرەهی بکەت، ئەوێن ژ ئالییێ ڕەوشتێ خوەڤە، لەکەدار و خرابکار نەبن، دا کو دووری کارلێکرنا خرابییا وان بت و ژێ پارزتی بت. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤی واریدا ژی دبێژت: (( المرء علی دین خلیله، فلینظر أحدکم من یخالل )) (ترمذی ڤەگوهازتییە). ئانکو: مرۆڤ ل سەر ڕێك و ڕێبازا هەڤالێ خوەیە. لەو دڤێت بزانت کا دێ کێ بۆ هەڤالینییێ هلبژێرت. ڤێجا دڤێت مرۆڤ هەڤالینییا کەسێن ڤەنج و ڕەوشتباش و خودان ئیرادە و گەشبین و ئیجابی و سەرکەڤتی و سەرفراز بکەت، دا د ژینگەهەکێدا بژیت، وی بەر ب دەروونبلندی و سەرفرازییا ماددی و مەعنەوی ببەت، و بشێت هاریکارییا غەیری خوە ژی بکەت، و بەرێ وان ژی بدەتە ژینگەهەکا ڕەوشتبلندتر و سەرفرازتر.

خواندنا ژیاننامەیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و یا پێشی و سەرکێشێن مەزنێن دیرۆکێ، مفایەکی مەزن دگەهینتە مرۆڤی، چونکی گەلەك چام و عیبرەت ژ سەربۆر و ئەزموونێن وان دئێنە وەرگرتن، و مرۆڤی پال

ددەنە سەرفرازی و ڕەوشتباشییێ، و ژ ڤێ هەمییێ، بۆ مە دیار دبت، کو ئەرکێ خۆرتێ باوەردار و هەر مرۆڤەکی ژیر و قەنجیخواز د ژیانێدا ئەوە، چاڤ ل کەسێن ڕەوشتباش و ئارمانجبلند و هێژا بکەت، و ئەو ب خوە ژی بۆ دەور و بەرێ خوە ببتە سەرمەشق و سەرکێشەکی باش.

## پسیار:

١- گرنگییا پەروەردەیا ڕەوشتی د چ تشتیدایە؟

٢- ئەرێ ئەم چاوا مفایی ژ سەرمەشقێن ڕەوشتبلند وەربگرین؟

## دان و ستاندن:

ئەرێ مە ب خوە دێ چاوا ڕۆل و دەور د پەروەردەکرنا ڕەوشتێ خوەدا هەبت؟

وانەیا دەهێ

## ئیســـلام و مـــافێن مـــرۆڤی

ئەڤرۆ، د جیهانێدا، گەلەك گرنگی ب مافێن مرۆڤی دئێتە دان، و بانگینا گەردوونی یا مـافێن مرۆڤـی ژی، وەك ئێـك ژ دەسـتكەفتێن مرۆڤـاتییێ دئێتـە هـەژمارتن، د سەدسـالا بیسـتێدا. د ڤـێ پشـكێدا، ئـەم دێ ل بـەر گەڕین، كو ب كورتی و ل بـەر ڕۆنـاهی و بـەرێخوەدانا بیـر و بـاوەرێن ئیسلامی، بەحسـێ ڤـان مافـان بكـەین، و هندەك ژ وان ژی ب درێژی بەرچاڤ بكەین.

**دانەناسینا مافێن مرۆڤی و پشكێن وان:**

مافێن مرۆڤی، ئەو مافن ئەوێن ژ بەر كو مرۆڤ مرۆڤە وەردگرت و مفـایی ژێ دبینـت، ئـەڤ مافـە د گـەل بوونا وی دبن و ب مرنا وی ب دووماهی دئێن، و ئارمـانج ژ ڤـان مافـان، ئـەوە مرۆڤـی و كەسـینییا وی و بهـایێن پێڤە گرێدایی بپارێزت. ژ بەر هندێ و هەر وەكی پێناسە و دانەناسینا وان دیاركری، كوم افـێن مرۆڤـی ل سـەر هزرەكا بنیـاتی ئاڤاكرینـە، ئـەو ژی مرۆڤبوونـا مرۆڤییـە. ئـانكو مـرۆڤ ب حـوكمێ مرۆڤبوونـا خـوە -دووری ڕەنگ و ڕەگەز و مللەت و نەژاد و دین و پەیسكا جڤـاكی -خـودانێ كۆمـەكا مـافێن سروشـتییە، ئـەوێن خـودێ داینێ، كو ب مرۆڤبوونا ویڤە گرێدایینە، و چو جڤاك و كۆم و دەولەت و هێزان ئەو هەقە نینە، ڤان مافان ژێ بستینن و لـێ بخون، چـونكی مـافێن وی بـەری دورسـتبوونا دەولـەتێ و جڤـاكێ ژی هەنـە. لـەو ئـەركێ هـەر دەستهلات و حوكمەتەكێیە، ل سەر بنسترا قانوونێ و ب كار و كریـار ڤـان مافـان بپـارێزت و سـەقایەكێ پەیـدا بكەت، مرۆڤ تێدا بشێت خوەشییێ ژ مـافێن خـوە ببینـت، ئەگـەر خـوە د بـەر ڤـێ ئێكێـڕا نەكـەت، ئەڤـە ئـەو دەستهلات و حوكمەتەكا نەدادپەروەر و ستەمكارە.

## ئیسلام و كەرامەتا مرۆڤاتییێ و مافێن مرۆڤی

كەرامەتا مرۆڤی ژێدەر و سەرەكانییا هەمی مافێن وی یێن بنیاتینە، كەرامەت بەلگە و نیشانا مرۆڤاتییـا مرۆڤییە، كو پـێ ژ چێكرییێن دی دئێتە جوداكرن و ڤاڤارتن. كەرامەتا مرۆڤی مەزنترین پالدەر و هانـدەربوو د درێژاهییا دیرۆكێدا، كو مرۆڤ د بەر هندێڕا كری بیر و باوەر و داب و نـەریتێن خـراب و نەدورست بنچۆك بكـەت و ب هنـدەك یاسـا و فـەرمانێن ئـایینی یـێن نـەرم و دلۆڤـان بگوهـۆڕت. د (**بانگینـا گـەردوونییا مـافێن مرۆڤی**)دا ژی، كو سالا (١٩٤٨) دەركەڤتییە، ئەڤ بەندە هاتییە: ((**هەڤاندنا وێ كەرامەتا خودێ دایییە مرۆڤی، و یەكسانییا مرۆڤان ب ڕێكا مافێن وان یێن ڕەوا و بنەجە، بنستر و بناخەیا ئازادی و دادپەروەری و ئاشتییێیە د جیهانێـدا**)). و د (**بەیاننامەیا ناڤدەولەتییا مـافێن مـەدەنی و سیاسـی**)دا ژی، كـو سـالا (١٩٦٦)ێ دەركەڤتییـە، هەمان بۆچوون هاتییە دووبارەكرن و تێدا هاتییە: ((**ژێدەر و سەرەكانییا ڤان هەمی مافان، كەرامەتا مرۆڤان و یەكسانییا وانە**)).

پشتی ڤێ ژی، فەرە ڕێزگرتنا ڤێ کەرامەتێ، خوە دەمێ جهێینانا جزایێن قانوونی ژی، بەرچاڤ بێتە وەرگرتن. ئانکو کەرامەتا مرۆڤی زێدەباری بهایێن دادپەروەرییێ، ژێدەرێ سەرەکییێ مەزناتییا مافێن مرۆڤییە.

ئایینێن ئەسمانی هەمی دەمان ب پشتگەرمی بەحسێ کەرامەتا مرۆڤی ئەوا خودێ داییێ کرییە، قورئانا پیرۆز کەرامەتا مرۆڤی ژ وان نیعمەت و کەرەمان هەژمارتییە ئەوێن خودایێ مەزن داییێ و هەر ژ بەر ڤێ کەرامەتێ، ب سەر هەمی چێکرییێن دی یێن ڤی گەردوونی ئێخستییە و مرۆڤ کرییە سەروەر و سەرداریێ بوونەوەری. هەر وەکی خودایێ مەزن دبێژت: (( **وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً** )) (الاسراء ٧٠). ڤێ ڕێزگرتن و ب قەدرخستنێ مرۆڤ کرییە جهنشین ل سەر ئەردی و بۆ هەمی خێر و بێرێن ئەرد و ئەسمانان بەردەست کرینە.

دان و کەرامەتا خودێ بۆ هەر مرۆڤەکێیە، ئەڤە ژ بەر مرۆڤبوونا وان، دووری نفش و نەژاد و ڕەگەز و ڕەنگ و دین و پەیسکا جڤاکی، چونکی خودایێ مەزن، کەرامەت ب مرۆڤی ب خوەڤە وەك چێکری گرێداییە، نەکو ب نفش و دەستەکەکا مرۆڤان یا تایبەتڤە، کو بەس باوەردار یان زەلام ب تنێ بن و غەیری وان ژێ زڕبار بت.

ب چاڤ و دیتنا ئیسلامێ، مرۆڤاتییێ ب سەرانسەری دین و مللەت و زمان و ڕەگەز و ڕەنگێن خوەڤە، ئێك ژێدەر هەیە و ژ ئێك نەفسێ پەیدابوویینە، و خودایێ مەزن قەدر و کەرامەت داییە وێ نەفسێ، ژ بەر هندێ، دەمێ دەمێ پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) وەك ڕێزگرتن، ب بەر تەرمێ جوهییەکێڤە ڕابوویە سەر پێیان، ئێك ژ هەڤال و هۆگرێن وی گۆتێ: پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤ تەرمە یێ ئێکی جوهییە (هەچکو بێژتێ هندێ نائینت کو پێغەمبەرێ خودێ ب بەرڤە ڕابت)، بەلێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ب ئیلهام وەرگرتنێ ژ وێ نەفسا کو سەر و دەستپێکا کەرامەتا یەکسانا خودێ داییە مرۆڤی، لێ زڤڕاند و گۆتێ: ((ألیس نفسا؟))، ئەرێ ما نە نەفسە؟ ئانکو: ما نە مرۆڤە؟ و تەمامکرنا فەرمۆدەیێ ڕۆن و ئاشکەرایە و هندێ دگەهینت، کو چونکی مرۆڤە و چێکرییێ خودێیە، دڤێت دووری بەرێخوەدانا دین و مەزهەب و ڕەنگ و زمانێ وی، ڕێز لێ بێتە گرتن و ب سڤکی نەئێتە دیتن.

هندی (دادپەروەری)یە ژی، هەما هند بەسە کو ئەم بزانن، خودایێ مەزن، ئارمانج ژ هنارتنا هەمی پێغەمبەرێن خوە ب درێژاهییا دیرۆکێ، د هندێدا کورت کرییە کو ئەو ستوونێن دادپەروەرییێ هلدن و موکوم بکەن، هەر وەکی ژ ڤێ ئایەتا قورئانا پیرۆز دیار دبت: (( **لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ** ... )) (الحدید ٢٥) ئانکو: مە پێغەمبەرێن خوە، ب بەلگە و نیشانێن ڕۆن و ئاشکەراڤە هنارتن، و مە کتێب و تەرازوو ژی د گەل وان هنارتنە خوارێ، دا خەلك دادپەروەرییێ ب جهـ بینن.

دادپەروەری ژی، یەکسانییێ ب خوەڤە دگرت، ئانکو یەکسانی پشکەکە ژ دادپەروەرییێ، هەر وەسا ئازادی ژی پشکەکا دییە ژێ. یەکسانی ژی ل ئێرە هندێ دگەهینت کو هەمی مرۆڤ ژ نفشێ بابئادەمن، و هەمی دووندەها ئێك دەیك و بابانە، و ئادەم ب خوە ژی ژ ئاخێ هاتییە چێکرن و دورستکرن، و ب ڤی ئاوایی، هەمی بەرانبەری یاسا و قانوونێ یەکسانن و هەمی ژی هێژایی هندێنە کو ببنە خودانێن وان هەمی مافێن بۆ مرۆڤان هاتینە دیارکرن، و یەکسانییا مرۆڤان ژی د کەرامەت و مرۆڤاتیییێدا، پێك و پەیسکەکا مەزنە د وارێ مافێن مرۆڤیدا.

هەر وەسا د فەرمۆدەیەکا قودسیدا هاتییە، کو خودایێ مەزن دبێژت: (( **يا عِبادي : إنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلى نَفسِي، وَ جَعَلْتَهُ بَينَكُمْ مُحَرَّماً فَلا تَظَالَمُوا** )). ئانکو: گەلی بەندەیێن من، ب ڕاستی من ستەم ل سەر خوە حەرام کرییە، و من د ناڤبەرا هەوە ب خوەدا ژی حەرام و قەدەغە کرییە، ڤێجا ستەم و زۆردارییێ ل ئێکدو نەکەن.

مافێن مرۆڤی ژی، د ڤی سەردەمێ مەدا، ئەگەر ب ئاوایەکی جوان بێنە جهێنان، دێ هەتا ڕادەیەکێ، ڕێکێ ل گەلەك ژ وێ ستەم و زۆردارییێ گرن ئەوا ل خەلکی دئێتە کرن، و ناهێلن دەستهلات و ڕژێمێن دکتاتۆرێن ستەمکار پەیدا ببن.

## پسیار:

١- ئیسلام چاوا بەرێ خوە ددەتە کەرامەتا مرۆڤی؟

٢- ئەرێ د ئیسلامێدا جوداییەك هەیە د ناڤبەرا کەرامەتا مرۆڤەکێ و ئێکی دیدا؟

وانەیا یازدەیێ

## بەردەستکرن و دەمانێن
## ئیسلامێ بۆ مافێ ئێمناهییا تەکمرۆڤی

ئیسلامێ مافێ ئێمناهییا تەکمرۆڤان وەك بنەما، هۆسا ب گشتی و گۆترە مسۆگەر نەکرییە، بەلکو کۆمەکا فەرمانان ژ بۆ بەردەستکرنا مافێن وان داناییە، نەمازە د وارێ یاسا و دادگەهاندا، و ژ گرنگترین وان دابینکرن و دەمانان ژی ئەڤێن خوارێنە:

١- بنەمایێ کەسینیبوونا بەرپسیارییا گونەهکاری (مبدأ شخصية المسؤولية الجنائية): ئانکو هەر کەسەك بەرپرسە ژ کریار و ڕەفتارێن خوە و ل سەر گونەها غەیری خوە یان خرابییا وی نائێتە جزاکرن، خودایێ مەزن دبێژت: (( وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ... )) (فاطر ١٨). ئانکو: گونەها کەسێ ناکەڤتە ستویێ کەسەکی دی.

پێغەمبەر ژی (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەکێدا دبێژت: (( لا يؤخذ الرجل بجريرة ابيه ولا بجريرة أخيه )). ئانکو: مرۆڤ ب گونەها بابێ خوە یان یا برایێ خوە نائێتە گونەهکارکرن و هەڤتووشی بەرپسیارییێ نابت، ژ ڤێرێ ڕەفتارێ دژمناهییێ د ناڤ ئێل و عەشیراندا و ڕەفتارێ دەستهلاتێن ستەمکار، ئەوێن کەس و کارێن مرۆڤی ل سەر هەلوێستی یان گونەها کەسەکێ، بنەمالەکێ و ئێل و عەشیرەکێ ئێزا ددەن و ئێمناهییا ژیان و شەرەف و مالا وان دئێخنە د تەقەلەق و ترسێدا، ڕەفتارەکی نەئیسلامی و نەڕەوایە.

٢- مافێ شەرعیبوون یان یاساییبوونا جزا و گونەهان: ئانکو چو گونەهان جزا ل سەر نینە، ئەگەر بەری هنگێ مرۆڤ ل سەر کرنا وان نەهاتبنە ئاگەهدارکرن و قەدەغەبوونا وان نەهاتبتە ڕاگەهاندن. د یاسایا داناییا سەردەمیدا دبێژنە ڤێ بنەمایێ: (هەر گونەه و جزایەك ل دووڤ قانوونێ نەبت، چو هەبوون بۆ نینە)، مە گەلەك ئایەت و فەرمۆدە هەنە تەئکیدێ ل سەر ڤی بنەمایی دکەن، خودایێ مەزن دبێژت: (( ... وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً )) (الاسراء ١٥) ئانکو: مە چو کۆم و مللەت ئێزا نەداینە، بەری ئەم پێغەمبەرەکێ بۆ وان بهنێرین و حەلال و حەرامان نیشا وان بدەین.

ل دووڤ ڤێ چەندێ ژی، ئیسلام پشتەڤانا دەولەتا یاسا و قانوونییە، و نابت ژ دەرڤەیی یاسایەکا پەیرەوکرییا دادپەروەر و بنەمایێن شەرعی، هەق و حساب د گەل کەسێ بێتە کرن، و دڤێت ماف و ئەرکێن فەرمانڕەوا و وەلاتییان ڕۆن و ئاشکەرابن.

٣- بنەمایێ نەزڤڕینا کارلێکرنا یاسایێن جزاکرنێ بۆ بەری دەرکەڤتنا وان (مبدأ عدم رجعيه القوانين): چونکی دلێ خەلك هنگێ ب ماف و ئازادییێن وان خوەشە، دەمێ تشتێ ئەو دکەن، ڕێ بۆ هاتبتە دان و ل دووڤ یاسایێ نەهاتبتە قەدەغەکرن، ئەگەر ئەڤ بنەمایە سەرپێ نەبایە، خەلك دا ژ هندێ ترست، نەکو قیامەتێ ئەڤ ڕەفتارە ب یاسایێ بێنە قەدەغەکرن و ل سەر بێنە ئێزادان و جزاکرن و ب ڤێ چەندێ ئەو پشتڕاست نەدبوون.

دەمێ زنا و دزی و ڤەخوارنا مەی و بێبەختیکرن د قورئانێدا هاتینە حەرامکرن، دەڤێن هاتینە خوار ل سەر ڕەفتارێن بەری هاتنەخوارا دەڤان نەهاتنە جهێنان، بەلکو ل سەر ڕەفتارێن پاشتر (یێن پشتی هاتنەخوارا دەڤان) هاتنە جهێنان.

**٤- بنەمایێ هەر کەسەك د بنیاتدا بێگونەهە:**

ل دووڤ دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێ، هەر مرۆڤەکێ هەبت بێگونەهە، هندی ژ ئالییێ یاسایێڤە و ب ڕێکا دادگەهێ، گونەهکاری ل سەر ڕاست دەرنەکەڤت. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( كُلُّ مَولُودٍ يُولَدُ عَلى الفطرة )) ئانکو: هەمی زارۆك ب پاڤژی و بێگونەهی ب سەر دنیایێ دکەڤن و چو خرابی و چو گونەهـ د گەل نابن.

ئێك ژ مفایێن ڤی بنەمایی ئەوە، ئەگەر ئێك خوە ب هندێ بینتە دەر کو هەقەکی وی ل دەڤ غەیری وییە، دڤێت بەلگە و شاهد ل سەر هندێ هەبن، دا داخوازا وی پێ بێتە چەسپاندن و داخواز ژ کەسێ شکاییێت لێ هاتییە کرن، نائێتە کرن بەلگە و شاهدان بینت، دا گونەهێ ژ خوە بدەتە پاش، چونکی د بنیاتدا وەسا هاتییە دانان کو هەقێ کەسێ ل دەڤ نینە، هەر وەسا ئێك ژ مفایێن دی یێن ڤی بنەمایی ئەوە، ئەگەر دادگەهێ گومانەك ل سەر داخوازێ هەبت، بۆ بەرژەوەندییا کەسێ گونەهکار، ئەوێ شکاییێت لێ هاتییە کرن دئێتە ئێخستن.

**پسیار:**

١- ژ بۆ گەهشتن و بەردەستکرنا مافێ ئێمناهییێ، مە پێدڤی ب کۆمەکا دەمان و دابینکرنان هەیە، بۆ چ؟

٢- د ئیسلامێدا، هەبوونا دابینکرن و دەمانان ژ بۆ گەهشتن و بەردەستکرنا مافێ ئێمناهییێ، چ ڕامانێ ددەت؟

## وانەیا دوازدەیێ

**سێ - مافێ یەکسانییێ:**

بنەمایێ یەکسانییێ بنەمایەکی بنیاتییە د ئایینێن ئەسمانی و بیرۆکەیا مافێن مرۆڤیدا ژی، ئایینێن ئەسمانی بانگ بۆ هندێ هلدێران کو هەمی مرۆڤ بەرانبەری خودێ یەکسانن، ئیسلامێ هەر ژ ڕێڤە بڕیار دا، کو هەمی مرۆڤ د کەرامەت و مافاندا یەکسانن، و هەر جوداهییەکا ل سەر بنسترا ڕەنگ و ڕەگەز و زمانی بێتە کرن، پەسەند نەکر، چونکی مرۆڤاتییێ د دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێدا ئێك بنیات هەیە، و مرۆڤ هەمی ژ ئێك دایك و باب پەیدابووینە، هەر وەکی قورئانا پیرۆز دبێژت: (( **هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ...** )) **(الأعراف ١٨٩)** ئانکو: خودێ هوون هەمی ژ ئێك نەفسێ و ئێك بنیات پەیداکرینە. دیسا خودایێ مەزن دبێژت: (( **يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ** )) **(الحجرات ١٣)** ئانکو: خەلکینۆ، مە هوون هەمی ژ نێر و مێیەکێ چێکرینە، و مە هوون کرینە ئێل و گرۆپ و مللەتێن جودا جودا، دا هوون ئێکدو بنیاسن و ب جوامێری و دلۆڤانی سەرەدەرییێ د گەل هەڤدو بکەن. ب ڕاستی کەسێ ژ هەوە هەمییان ب قەدرتر ل دەڤ خودێ (د ئاخرەتێدا)، کەسێ ژ هەوە هەمییان پارێزکارتر و تەقواترە.

د ڤێ ئایەتێدا، خودایێ مەزن گازی هەمی خەلکی دکەت (( **يَا أَيُّهَا النَّاسُ** ))، نە بەس گازی باوەرداران دکەت، و مە پشتڕاست دکەت، کو بنیاتێ هەمی مرۆڤاتییێ ئێکە. پێغەمبەر ژی (سلاڤ لێ بن) د گەلەك فەرمۆدەیێن خوەدا گرنگییا یەکسانییێ بۆ مە ڕۆن و ئاشکەرا دکەت، و د ڤێ فەرمۆدەیێدا دبێژت: (( **أيها الناس ان ربّكم واحد، وان أباكم واحد، كلكم لآدم وآدم من تراب، ان أكرمكم عند الله أتقاكم، لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأعجمي على عربي، ولا أسود على أحمر ولا أحمر على أسود إلاّ بالتّقوى، اللّهم هل بلغت اللّهم فاشهد ، ألا فليبلغ الشاهد منكم الغائب** )). ئانکو: خەلکینۆ (هەمی خەلك بێ جوداییا ئایین و ڕەگەز و ڕەنگ و زمانان) ب ڕاستی پەروەردگارێ هەوە ئێکە، هوون هەمی ژ ئادەمن و ئادەم ژی ژ ئاخێیە، یێ ژ هەوە هەمییان ب قەدرتر ل دەڤ خودێ، ئەوە یێ ژ هەوە هەمییان پارێزکارتر و قەنجیکارتر، و بزانن یێ عەرەب، نە ژ غەیری عەرەبی ب قەدرترە، و یێ غەیری عەرەب ژی نە ژ یێ عەرەب ب قەدرترە، کەسێ ڕەش نە ژ یێ سۆر ب قەدرترە، و یێ سۆر ژی ب سەر یێ ڕەش نائێتە ئێخستن، ئەگەر ب تەقواداری و قەنجیکارییێ نەبت، خودێۆ من نامە و پەیاما تە گەهاند و تو ل سەر شاهدبە، بلا کەسێ ل ئێرە بەرهەڤ و ئامادە و پەیام بهیستی، بگەهینتە یێ نەبهیستی و نەئامادە.

ژ بەر هندێ، د ئیسلامێدا، مرۆڤێ پلەئێك و پلەدو نینە، هەر مرۆڤەك چێکرییێ خودایێ مەزنە و ب وی گیانی زێندییە ئەوێ خودایێ مەزن داییێ، و خودان کەرامەتە ژی. ڕێز و پلە و پەیسك نە ب نفش و ڕەگەز و مللەت و ڕەنگ و ئێل و عەشیرەت و بنەمالێیە، بەلکو ب تشتەکێیە، ل بەر دەستێ هەر مرۆڤەکێیە، و هەر مرۆڤەك دشێت مفایی ژێ وەربگرت و هەڤبەندی ب ئیرادە و ڤیانا ویڤە هەیە، کو ئەو ژی تەقواداری و

قەنجیکارییە. ژار و دەولەمەند بت، پیست سپی و پیست ڕەش بت، کورد بت یان عەرەب بت، یان هەر میللەتەکی دی بت، بەرانبەری یاسایا خودێ یەکسانن، پێدڤییە هەست ب ڤێ یەکسانیکرنێ ژی، د دلێ هەر ئێك ژ مەدا کوور بێتە چەسپاندن.

## جوونێن یەکسانییێ

بنەمایێ یەکسانییێ، ل سەر کۆمەکا چەق و جوونان بەلاڤ دبت، ئەو ژی ئەڤەنە:

**أ- یەکسانی بەرانبەری شەرع و یاسایێ:**

ئیسلام د بڕیاردانا مافێ یەکسانییێدا، بەرانبەری شەرع و یاسایێ، بەراهیکێش بوو. ژ ئێکا ماف و ئەرکانڤە سەرەدەرییەکا یەکسان د گەل هەمی خەلکی دئێتە کرن، و بەرانبەری هەمان دادگەه و یاسایێ دادوەری د گەل وان دئێتە کرن، و ژ بۆ جهێینانا فەرمانێن شەرعی و یاسایی، کەس ژ کەسێ نائێتە جوداکرن و کەس نائێتە بەرەدایی‌کرن. د وارێ جهێینانا یاسایێدا، بێ مهانە و هەجەتەکا شەرع و یاسایێ ڤەبڕی و دەستنیشانکری، کەس نائێتە بەرەدایی‌کرن، و هەر ژ بەر هندێ ژی، د ئیسلامێدا، چیناتی و بەرەکاتی و ڕەگەزپەرستییێ چو جهێ خوە نینە. پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەکێدا، جوداییکرنا ژار و دەولەمەندان د دەمێ جهێینانا یاسایێدا، دکەتە ژێدەرێ وێرانبوون و تێچوون و نەمانا میللەت و شارستانییان و دبێژت: (( انّما اهلك الذين قبلكم انّهم كانوا اذا سرق فيهم الشريف تركوه و اذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد، وأيْمُ الله لو انّ فاطمة بنت محمد سرقت لقطعتُ يدها )) ئانکو: ئەڤ خەلکێ بەری هەوە ب هندێ بەرئاتاف بوون و نەمان، دەمێ ماقوول و مالمەزنان د ناڤ واندا دزی دکرن، چاڤێن خوە ژێ دگرتن، و گاڤا ژار و بێ دەستهلاتەکێ دزی دکر، یاسا و قانوون د ڕاستێدا ب جە دئینان، بەلێ هوون بزانن و پشتڕاست بن، ئەز ب خودێ کەم، خوە فاتمایا کچا موحەممەد دزییێ بکەت، ئەز دێ دەستێ وێ بڕم.

بەرپەڕێن گەشێن دیرۆکا ئیسلامێ، تێر و تژینە ژ وان نموونەیێن یەکسانییا خەلکی بەرانبەری یاسایێ بەرچاڤ دکەن. بۆ نموونە (عەلییێ کوڕێ ئەبووتالب) خەلیفەیێ موسلمانان یێ چارێ، جوهییەکێ گازندەیەك ل سەر تۆمارکر و ب هندێ گونەهکارکر کو مەرتالێ وی ژێ ستاندییە، خەلیفە ب خوە د گەل چوو دادگەهێ، و ڕازی نەبوو دادوەر سەرەدەرییەکا وەسا د گەل بکەت، کو جودابت ژ یا یێ جوهی، چونکی وی ب خوە قەناعەت ب دادپەروەرییا ئیسلامێ و یەکسانییا هەمییان بەرانبەری یاسایێ هەبوو.

ئەڤە ژی هندێ دگەهینت، کو ل دووڤ دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێ، فەرمانڕەوا و وەلاتی، د وارێ جهێینانا یاسایێدا، یەکسانن، و کەس و ب هەر مهانەیەکا هەبت، د سەر شەرع و یاسایێرا نینە.

**ب- یەکسانی بەرانبەری دادگەهێ:**

ئەگەر یەکسانی ڕامانا دادپەروەرییێ بدەت، و دادپەروەری ژی ژ مەزنترین ئارمانجێن ئیسلامێ بت، هنگێ یەکسانییا سەرانسەری خەلکی بەرانبەری یاسایێ، ئەنجاما سروشتییا بنەمایێ یەکسانییێیە

بەرانبەری شەرع و یاسایێ. ئەڤە ژی وێ ڕامانێ ددەت کو دڤێت سەرانسەری وەلاتییان سەرێ گوهدارییێ بۆ دادگەهێ بچەمینن و نابت د ڤی واریدا کەسێ مافەکی تایبەت هەبت، و ژ ڤێ یاسایا گشتی بێتە بەرەدایيکرن. پێدڤییە د ئاوایێ دووڤچوون و ڤەکۆلانا گونەهێ و دەمانێن یاسایی و سەپاندنا جزاییدا، بێ جودایی، هەمی یەکسان بن. د ئاخڤتنا ئیمام (عومەرێ کوڕێ خەتتاب)دا (خودێ ژێ ڕازی بت) ئەوا بۆ دادوەر (ئەبوو مووسایێ ئەشعەری) هنارتی هاتییە: (( آس بين الناس في مجلسك ووجهك حتى لا يطمع شريف في حيفك ولا يخاف ضعيف من جورك )) ئانکو: دەمێ دادگەهکرنێ، ب یەکسانی سەرەدەرییێ د گەل خەلکی بکە، دا ماقوول و دەولەمەند تەماییا هندێ نەکەن کو تو چاڤێن خوە ژ وان بگری، و ژار و بێ دەستهلات ژی، ژ دادپەروەرییا تە بێ هیڤی نەبن.

دڤێت دادوەر دەلیڤە و دەرفەتا یەکسان بدەتە هەردو ئالییێن نەلێك، دا بشێن ئاخڤتن و داخوازێن خوە بسەلمینن، و بەلگە و نیشانێن خوە بەرچاڤ بکەن. پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دەمێ (عەلییێ کوڕێ ئەبووتالب) وەك دادوەر هنارتییە یەمەنێ، گۆتێ: (( ... فاذا جلس بين يديك خصمان فلا تقضين حتى تسمع كلام الآخر كما سمعت كلام الأول )). ئانکو: دەمێ دو کەسێن نەلێك گازندەیا خوە دگەهیننە تە و ڕووبارى تە دبن، هەتا تو گوهدارییا ئاخڤتنا هەردو ئالییان نەکی، دادوەرییێ د ناڤبەرا واندا نەکە.

#### جـ- یەکسانی د وەرگرتنا پێك و پەیسکێن گشتیدا (الوظائف العامة):

ئیسلامێ شیان و دەستپاکی و دلبێشی (الاخلاڵ) کرییە پیڤکێ وەرگرتنا پێك و پەیسکێن گشتی، و ئەڤ مافە ژی، نە مافەکی تایبەتە ب چو بەرەك و چین و گرۆپێن دەستنیشانکریڤە، د ڤی واریدا، تشتێ گرنگ ئەوە، کەسێ هێژا د جهێ هێژادا بت، و دادپەروەری بێتە جهێنان، و مرۆڤ مرۆڤکانێ و نەیەکسانی و گەندەلی و خرابکارئینانا دەستهلاتێ نەبت. قورئان ل سەر زمانێ کچا شوعەیب پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) سالۆخەتێن وی کەسی دیار دکەت، ئەوێ دڤێت کار پێ بێتە سپارتن و دبێژت: (( ... إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ )) (القصص ٢٦) ئانکو: ئەڤ کەسێ کو تو دێ ب کرێ گری و کاری پێ دەیە کرن- کو مووسا پێغەمبەربوو باشترین کەسە و خودان شیانە و مرۆڤەکی دەستپاك و سەرڕاستە. میر و سەرداری باوەرداران عومەرێ کوڕێ خەتتاب (خودێ ژێ ڕازی بت) ژی، د دەرهەقێ هندەك مەرجێن دەستنیشانکرن و دامەزراندنا کار ب دەستێن دەولەتێدا دبێژت: (( أريد رجلاً إذا كان في القومِ وليس أميرهم كان كأنه أميرهم، و إذا كان أميرهم كان كأنه رجلٌ منهم )) ئانکو: من ئەو زەلام دڤێت (بۆ کار ب دەستییێ) بەری ببتە کار ب دەست، وەك کار ب دەستان بت، و پشتی دبتە کار ب دەست ژی، وەسا بت هەچکو ئێك ژ خەلکی. و د نامەیەکا دیدا دبێژت کو بۆ سەعدێ کوڕێ ئەبی وەقاسس (خودێ ژێ ڕازی بت) هنارتبوو: (( ان الله ليس بينه و بين أحد نسب إلاّ بطاعته و الناس شريفهم و وضيعهم في ذات الله سواء )) ئانکو: چو مرۆڤانی د ناڤبەرا خودێ و کەسێدا نینە د دنیایێدا،

مرۆڤانییا خودێ ب پەرستن و گوهدارییا وییە، و خەلك هەمی، چ ماقوول چ گەدا، چ دەولەمەند چ ژار و خیزان، بەرانبەری خودێ وەکهەڤ و یەکسانن.

د- یەکسانی د پەرستنێدا :

ئیسلام ژ ئالییێ پەرستن و ئەرکێن گشتیڤە، جوداهییێ نائێختە ناڤبەرا خەلکی. دەولەمەند و ژار و خیزانان، زەلام و ژنان، ئێك جوونێ خودێپەرێسییێ هەیە، نە هەر ئێکێ جوونەکی جودا هەیە. ئەگەر هندەك جاران جوونە جوداییەك هەبت ژی، یا وێ ب سانەهیکرنێیە، ئەوا هەر ژ بۆ جهێینانا دادپەروەرییێ ل کار، وەکی ڕاکرنا فەرزا حەجێ و دانا زەکاتێ ل سەر کەسێن ژار و دەستتەنگ.

## پسیار:

١- ئیسلام ب ئاوایەکی گشتی، چاوا بەرێ خوە ددەتە یەکسانییێ د ناڤبەرا خەلکیدا؟

٢- ئەرێ د ئیسلامێدا مللەت و ڕەگەزەکی دەستنیشانکری هەیە، کو ب سەر غەیری خوە هاتبتە ئێخستن؟ ئەگەر نەبت، بۆ چ؟

٣- هەستکرن ب یەکسانییێ، چ کارلێکرن ل سەر مرۆڤێ باوەردار هەیە؟

## دان و ستاندن :

یەکسانییا مللەتان -ل دووڤ بەرێخوەدان و دیتنا ئیسلامێ -ئەڤرۆ چ هەڤبەندی ب مافێن وانڤە هەیە؟

## وانەیا سێزدەیێ

### ٤- ئازادییا بیر و باوەر و ئایینیٚ:

مەرەم ژ ئازادییا بیر و باوەر و ئایینیٚ ئەوە، کو مرۆڤ د هلبژارتنا بیر و باوەر و دینیٚ خوەدا ئازاد بت، بیٚ کو دەستهلاتەك یان ئالییەك ل سەر مرۆڤی بسەپینت.

د سەردەمەکێدا کو سەپاندنا بیر و باوەران ل سەر خەلکی ڕەفتارەکی بەربەلاڤ بوو، ئیسلام هات و بانگ و گازییا ئازادییا باوەریئینان و ئایینیٚ هلدێرا، و دژی کۆتەکی و دەمارگیرییا ئایینی ڕاوەستا و گەلەك ئایەت و فەرمۆدە هەنە، پشتەڤانییا ڤی بنەمایی دکەن. قورئانا پیرۆز دبێژت: (( **لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ...** )) (البقرة ٢٥٦). ئانکو: کۆتەکی و زۆری د دینیدا نینە و نابت کەس ب زۆر بێتە موسلمانکرن، ڕێکا ڕاست و یا گومراییێ ژ ئێکدو هاتینە جوداکرن و مرۆڤ ئازادە کا دیٚ کیژان ڕێکیٚ هلبژێرت. هەر وەسا خودایێ مەزن دبێژتە پێغەمبەری: (( **وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ** )) (یونس ٩٩). ئانکو: ئەگەر خودایێ تە ڤیابا، هندی مرۆڤێن ل سەر ڕوویێ ڤی ئەردی، دا باوەرییێ ئینن (بەلیٚ ئەوی ئەڤە نەڤیاییە و ئازادییا باوەریئینانێ کرییە د دەست واندا) ڤێجا ما تو دیٚ کۆتەکییێ ل وان کەی، و وان ب زۆری کەیە باوەردار؟ دیار و ئاشکەرایە کو ژ بۆ گوهشینیٚ پسیار هاتییە کرن و هندیٚ ژی دگەهینت کو خودایێ مەزن ئەو ماف خوە نەداییە پێغەمبەری ژی، کو خەلکی ب زۆری بکەتە موسلمان، و باریٚ ل سەر ملیٚ وی، ب تنێ ئەوە، پەیاما ژ بەریٚ خودێڤە بۆ هاتییە هنارتن، باش ڕاگەهینت: (( **... وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ** )) (آل عمران ٢٠) ئانکو: بێژە وان ئەوێن کتێب بۆ وان هاتینە هنارتن و ئەوێن بۆ وان نەهاتینە هنارتن، ئەریٚ هوون موسلمان بوون و هەوە باوەری ئینا؟ ئەگەر ئەو موسلمان بوون و وان باوەری ئینا، ئەڤە ئەو ڕاستەڕیٚ بوون، و ئەگەر نە، هنگیٚ بزانە ئەرکیٚ تە بەس گەهاندنا پەیاما خودێیە و زێدەتر نە.

چونکی خودیٚ ئازادییا هلبژارتنا ئایینیٚ و باوەریٚ داییە مرۆڤی و ڕۆژا قیامەتیٚ بەرانبەری خودیٚ بەرپسیارە ژ ویٚ ئازادییێ، و ئەرکیٚ پێغەمبەری (سلاڤ لیٚ بن) و بیٚ زانا و بانگهلدێران پشتی وی هەتا ڕۆژا قیامەتیٚ، ڕۆنکرن و ئاشکەراکرنا هەڤییٚ و ڕاستییانە، شیرەتکرن و پێکۆلە ژ بۆ پەیداکرنا قەناعەتا وان، دا ڕێکا ڕاست و دورست بگرن: (( **وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ ...** )) (الکهف ٢٩). ئانکو: هەی موحەممەد، ئەو ڕاستی و هەڤییا ژ نك خودیٚ بۆ تە هاتی بگەهینە خەلکی، ڤێجا یێ ڤیا بلا باوەرییێ بینت و یێ نەڤیا ژی، بلا گاور و بێباوەر ببت.

ژ وان بەردەست و دەمانێن قورئان بەحس دکەت، بۆ ئازادییا بیر و باوەر و ئایین و پەرستنیٚ، بۆ دووکەڤتییێن ئایینێن دی، و نەمازە ئایینێن ئەسمانی، ئەوە کو ل سەر مرۆڤیٚ موسلمان حەرامکرییە گەنگەشەییٚ د گەل وان بکەت، ئەگەر ب نەرمی و خوەشی نەبت، خودایێ مەزن دبێژت: (( **وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ**

الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ ... )) (العنكبوت ٤٦). ئانكو: ئەگەر ب باشترین و جوانترین ڕەنگ و ئاوا نەبت، گەنگەشەیێ د گەل دووکەڤتی و پشتەڤانێن ئایینێن دی نەکەن.

ل بەر ڕۆناهییا ڤان بنەما و دەقێن پیرۆز و بلندێن ئیسلامێ و شەریعەتا وێ، ئیسلامێ ئازادییا پەرستنێ بۆ پشتەڤان و دووکەڤتییێن ئایینێن دی دابین کرییە، و هەر ژ بەر هندێ، ل سەر موسلمانان حەرام کرییە کو دەستدرێژییێ د ڕاستا پەرستگەه و بیر و باوەرێن واندا بکەن، و مافێ وانە ئەو د وارێ بیر و باوەر و ڕەوشا کەساتییێدا، ل دووف ڕێ و دەستوورا ئایینێن خوە بچن، هەتا ئەو تشتێن د ئیسلامێدا قەدەغە و ل دەڤ وان حەلال ژی، وەکی مەیڤەخوارنێ و خوارنا گۆشتێ بەرازی، ل وان نائێنە قەدەغەکرن.

ژ ئالییێ دیرۆکیڤە ژی، وەلاتێن ئیسلامی ل بەر دەولەتێن دی یێن جیهانێ، بەرفرەهترین ئاخ و کاخا ئازادییا ئایین و بیر و باوەران بوو، بۆ نموونە ل سەر دەمێ عەباسییان، زانایێن دووکەڤتییێن ئایینێن دی و هندەك جاران بێدین و بێباوەران ژی، ل مزگەفت و خواندنگەه و کۆچکا سولتانان، ب ئاوایەکی زانستی دان و ستاندن و گەنگەشە ل سەر ئایینان دکر.

ب کورتی ئیسلام ئازادییا بیر و باوەر و ئایینێ، بۆ نەموسلمانان ژی دابین دکەت، و ئازادییا خودێپەرێسییێ ژی ددەتە وان، و زانایان ژی، د ڤی واریدا، هندەك فەرمانێن گشتی ژ قورئانێ و فەرمۆدەیێن پێغەمبەری دەرخستینە و دبێژن: (( اترکوهم و ما یدینون )) ئانکو: ژ وان ڤەبن بلا ل دووف دەستوورێ دینێ خوە خودێ بپەرێسن، و ژین و ژیارا خوە ب ڕێڤە ببەن. ئیسلام هەر ژ دەستپێکا پەیدابوونا خوە، خودانێ ڤی درووشمێ زێڕینە (( لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ))، هەتا ئازادییا مرۆڤێن دوڕوو ژی د بن سیبەرا ئیسلامێڤە هاتبوو پارزتن، هەر چەندە وان ژ بەرێ خوەڤە بەرۆکێ جەنگا دەروونی د ڕوویێ موسلماندا ڤەکربوو، و ب ئاوایەکی کرێت بەحسێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و باوەرداران دکرن، هەر ژ بەر هندێ، نە کەسێ ب زۆری دکەتە موسلمان، و نە موسلمانی ژی ب زۆری د ناڤ چارچۆڤ و بازنێ ئیسلامێدا دهێلت و ئاسێ دکەت، چونکی باوەرێ هەڤبەندی ب دل و دەروون و ناڤزك و قەناعەتا مرۆڤیڤە هەیە، لامانێ د هەمی قورئانێدا، ئێك ئایەت ب تنێ ژی نینە بێژت ئەوێ ژ ئیسلامێ دەرکەڤت دڤێت بێتە کوشتن، بەلکو تنێ بەحسێ هندێ دکەت، کو ئەو د قیامەتێدا دێ بەرهنگاری جزا و ئیزایی بت.

**پسیار:**

١- دێ چاوا ب بەلگە و نیشان دییە دیارکرن، کو ئیسلامێ باوەری ب ئازادییا بیر و باوەر و ئایینێ هەیە؟

٢- ژ بەر چ دەستدرێژیکرن د ڕاستا ئایین و بیر و باوەر و پەرستگەه و مافێن دووکەڤتییێن ئایینێن دیدا قەدەغەیە؟

## وانەیا چاردەیێ

### ٥- ئازادییا بیر و باوەر و ڕادەربڕینێ:

ئەڤ مافە وێ ڕامانێ ددەت، کو مرۆڤ سەربەستە د دەربڕینا وێ بیر و بۆچوون و هزرێدا ئەوا باوەرییێ پێ دئینت، چ ب ئاشکەرایی چ ژی نەپەنی، چ ب زمانی بت، چ ژی ب نڤیسینێ یان ب هەر ڕێك و ئالاڤەکی دی یێ ڕاگەهاندن و بەلاڤکرنێ بت.

ئیسلام ب درێژاهییا دیرۆکێ، ژ وان دین و شەریعەتانە، ئەوێن ئەقلێ مرۆڤی ژ گەلەك قەید و پێبەند و ئاستەنگان ڕزگارکری، و هاندایییە کو ئازادانە هزرا خوە د نهێنییێن گەردوونی و ژیانا مرۆڤی ب خوەدا بکەت. هەر وەسا خودایێ مەزن گەلەك پەسنێن ئاقلدار و وان کەسان کرییە ئەوێن شیانا خوە یا ئەقلی ب کار دئینن و ڕازی نابن کۆرانە چاڤ ل باب و باپیرێن خوە یان ل خەلکەکی دی بکەن، هەر وەکی خودایێ مەزن دبێژت: (( إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ )) (الجاثية ١٣) یان دبێژت: (( وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ )) (آل عمران ٧). ئەڤ ئایەتە دیار دکە نکو کەسێن خودان هش و هشیار و ئەوێن هزرێن خوە دکەن، وان شیانا هندێ هەیە ئایەتێن خودێ و پەیاما وی باش تێبگەهن.

مرۆڤ ل دووڤ دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێ، ئازادە کو د هەر وارەکێدا بنڤیست یان ب ڤەکۆلانەکا دەستنیشانکری ڕابت، ب مەرجەکێ سیستەمێ گشتییێ جڤاکێ بەرچاڤ وەرگرت. پێکۆلکرن (ئیجتیهاد) ئاشکەراترین بەلگە و نیشانە کو ئیسلام ڕێزێ ل بیر و باوەران دگرت و پشتەڤانییا ئازادییا وان دکەت. مافێ زانایانە ژ بۆ بەرسڤدانا پسیاران و دیتنا چارەیان بۆ هەر ئیشك گرفتارییەکێ، پشتا خوە ب پێکۆلکرنێ گرێبدەن، وەك ژێدەرەك بۆ چارەسەرکرنێ، ئانکو ئەقلێ خوە بدەنە شۆلی و بیر و بۆچوون و هزرێن خوە ل دۆر وان بابەتان دیار بکەن و پرسا چارەسەرکرنا هەر دۆزەکا بێ چارە مایی بکەن.

باوەریئینان ب مافێ (ئیجتیهاد)ێ ژی، باوەریئینان و هەڤاندن و ڕێزگرتنا مافێ جودابییا هزرییە، چونکی هزرکرنا هەمی زانایان نە وەکی ئێکە، و گەلەك جاران وان ل دۆر مەسەلە و دۆزەکا دەستنیشانکری، گەلەك هزر و بۆچوونێن جودا جودا هەنە. مافێ جودابیبوونێ ژی، دخوازت کو خەلك ژ بەرێ دەستهلاتێ یان یێ دەولەتێ یان ژی یێ کۆرەکی زانایانڤە، نەئێتە نەچارکرن، کو ل دووڤ بیر و بۆچوونەکا دەستنیشانکری بچن، و بیر و بۆچوونێن دی قەدەغە بکەن. هەر وەسا زانا دبێژن، فەرمانکرنا قەنجییێ و دانەپاشا خرابییێ، د وان تشتاندا دورست (جائز) نینە، ئەوێن بیر و بۆچوون و هزرێن جودا ل سەر هەبن.

ئیسلام پەیامەکا هزری و خودابییا ڕۆن و ئاشکەرا و ب هێزە، چو جاران ترس ژ ئازادییا بیر و باوەران ڕانەکرییە، چونکی د ڕەوشا ئازادییێدا و د بن سیبەرا وێڤە، سنج و بهایێن وێ پتر وەرارێ دکەن و گەش دبن. ئەگەر ئیسلامێ د هەستیارترین مەسەلەدا، ئانکو مەسەلەیا باوەریئینانێ و هلبژارتنا ئایینێدا مرۆڤ ئازاد کربت و مافێ جودابییا ئایینێ ژی بۆ خودانێن ئایینێن دی مسۆگەر کربت، ڕۆن و ئاشکەرایە کو د

ئاستێن دی یێن بیر و ڕایێن سیاسی و جڤاکی و ئابۆریدا، ڕێباز و درووشمێ ئیسلامێ ئازادییە. لەو هەر بزاڤ و پێکۆلەکا بێتە کرن، ژ بۆ سەپاندنا بیر و بۆچوونەکا دەستنیشانکری یان قەدەغەکرنا خەلکی د چارچۆڤێ یاسا و پارزتنا پێکڤەژیانا ئاشتیخوازدا، ئەگەر ب ناڤێ ئیسلامێ ژی بێتە جهێنان، د ناڤەرۆکا خوەدا، دژی گیانێ ئیسلامێ و بەهاییێن بلندێن وێیە و ئیسلام پێ ڕازی نینە، ئەگەر ئازادییا بیر و ڕایان بەرێ گرنگ بووبت و ئیسلامێ ب ڤی چاڤی بەرێ خوە دابتێ، و دیرۆکا ئیسلامێ ئەڤ هەمی بیر و بۆچوون و ڕایێن جودا دیتبن و بینابن، ئەها ئەڤرۆ ئەڤ دۆزە گەلەک ژ بەرێفەرتر و گرنگترە و خەلك ب خوە ژی بەرانبەری وێ هەستیارترن.

ژ بەر هندێ، ئەوێن ئیسلامێ و ئازادییێ وەك هەڤدژ بەرانبەری ئێك دکەن، و داخوازێ ژ خەلکی دکەن کو ئێك ژ هەردویان هلبژێرن، ب هندێ ستەم و زۆردارییێ ل ئیسلامێ دکەن و ئارمانجێن وێ یێن بلند فام ناکەن، و پێك و پەیسکا وێ ژی ل سەر ئاستێ جیهانێ، ب ئاوایەکی نزم بەرچاڤ دکەن. و ب درێژاهییا دیرۆکێ تشتێ گەلەك زیان ل ئیسلامێ کری نەکو نەبوونا ئازادییێ بوو، بەلکو زۆرداری و نەبوونا ئازادییان بوو.

## پسیار:

١- بۆ چ دڤێت ئازادییا بیر و بیر و ڕا دەربڕینێ بێتە دابینکرن؟

٢- ئەرێ ما ئیسلامێ قەدەغەکرییە کو ئەم ئەقلێ خوە ژ بۆ پێشخستنا شارستانی و فلیکارییێ ب کاربینن؟

## دان و ستاندن:

هەر چەندە ئیسلامێ ئازادییا بیر و باوەران ب مافەکی ڕەوایێ مرۆڤی هەژمارتییە، لێ د گەل هندێ ژی، پشکەك ژ جڤاکا موسلمانان د ڤی واریدا پاشکەڤتینە، بۆ چ؟

## وانەیا پازدەیێ

### ٦- مافێ ئازادییا کارکرنێ:

تشتەکی ڕۆن و ئاشکەرایە کو کارکرن ژ گرنگترین هۆکارێن ژیان و بەرهەمئینانێیە، هەمی ئایین و چان و چاکسازان مرۆڤ د بەر کارکرنێڕا کرییە، و بەرێ وی ژ تەنبەلی و بێکارییێ داییە پاش. دینێ ئیسلامێ گەلەك پووتە و گرنگی داییە کارکرنێ، خودێ دبێژت: (( وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ ... )) (التوبة ١٠٥) ئانکو: خودێ فەرمانا باوەرداران دکەت، کو کار بکەن و وان وەسا تێ دگەهینت کو هەر تشتەکێ ئەو بکەن خودێ و پێغەمبەر و باوەردار دێ بینن.

گەلەك فەرمۆدە ژی هەنە، مرۆڤی پال ددەنە کارکرنێ و بێکارییێ ب کێماسی بەرچاف دکەن، پێغەمبەر (سلاف لێ بن) دبێژت: (( أفضَلُ الكَسبِ بيعٌ مبرورٌ، وعمل الرجل بيدهِ )) ئانکو: باشترین کارکرن کڕین و فرۆتن و شۆلکرنا مرۆڤییە ب زەند و باسکێن خوە. هەر وەسا دبێژت: (( انّ الله يحبُ المؤمن المحترفَ )) ئانکو: خودێ باوەرداڕێ پیشەکار دڤێت. دیسا دبێژت: (( انّ الله تعالى يحب اذا عمل احدكم عملاً ان يتقنه )) ئانکو: ب ڕاستی خودێ پێ خوەشە دەمێ ئێك ژ هەوە کارەکێ دکەت، باش بکەت و ب دلبێشی ژ دەرهەڤێ وی دەرکەڤت.

دیارە کارکرنێ و شۆڕەشا پیشەسازی، د جڤاکا هەڤچەرخدا، گرنگییەکا مەزن پەیداکرییە، و پالە و کرێکار ژی بوویینە چینەکا مەزن و کارلێکەر د ناف سەندیکا و جڤاکێدا، و وان ڕۆلەکی مەزن د ژیانا پیشەیی و هندەك جاران یا سیاسیدا هەیە.

مەرەم ژ مافێ کارکرنێ ژی ئەوە، کو مرۆڤی ئەو ماف ل سەر دەولەتێ و جڤاکێ هەیە کو نەمینتە بێکار و دەلیڤە و دەرفەتا کاری بۆ بێتە پەیداکرن، و ڕێك ل کارکرنا وی نەئێتە گرتن. ئازادییا کارکرنێ ژی ئەوە کو مرۆڤی مافێ هندێ هەبت، کارێ بڤێت بکەت و یێ نەڤێت بهێلت، و کارێ ل دوو دلێ خوە هلبژێرت، و ب کۆتەکی کارەکی دەستنیشانکری لێ نەئێتە قەدەغەکرن و ئێکی دی ب زۆری ل سەر نەئێتە سەپاندن، هەر وەکی پێشتر د هندەك قۆناخێن دیرۆکیدا ل کار.

ل ئێرە ژی ئەم دێ پێکۆلێ کەین، هەر تشتەکێ گرێدایی ب ڤی کاریڤە کورت بکەین:

### ١- زخاندن و پالدانا کارکرنێ:

ئیسلام مە پال ددەت کو ئەم حەز ژ کارکرنێ بکەین و ببتە پشکەك ژ ژیانا مە و پشتا خوە بدەینە تەنبەلی و بێکارییێ. پێغەمبەر (سلاف لێ بن) دبێژت: (( من أمسى كالاً من عملِ يَدهِ أمسى مغفوراً لـهُ )). ئانکو: هەر کەسێ نانێ خوها ئەنییا خوە و دەستێ خوە بخوت، و ڕۆژا خوە ب کاریڤە دەرباز بکەت، خودێ دێ لێ بۆرت.

ئەڤ فەرمۆدەیا هە، بهایێ کارکرنێ هند بلند و پیرۆز دکەت، کو خودێ ب وێ مەزنییا خوەڤە، مرۆڤی ل سەر ب لێبۆرینا خوە خەلات دکەت، و ئەڤە ژی وێ ڕامانێ ددەت، کو کارکرنا ڤەنج و حەلال و بێ فند و فێل، ل دەڤ خودێ، ژ کار و کریارێن ڤەنج دئێتە هەژمارتن.

هەر وەسا پێغەمبەر (سلاف لێ بن) گەڤان ل کەسێن بێکار و نەقەت دکەت، ئەوێن ب نان و زك ڕازی دبن، و دبێژت: (( اشدُّ الناس عذاباً يوم القيامةِ الكفي الفارغ )) ئانکو: بێکار و نەقەت و کەدنەکەرێن ب نان و زك ڕازی،

خودێ ڕۆژا قیامەتێ دێ دژوارترین ئیزایێ دەتە وان. چونکی ئیسلامێ نەڤێت مرۆڤ بمینتە ب هیڤیا خەلکیڤە، و چاڤێ وی ل بەر دەستێ وان بت، بەلکو دڤێت مرۆڤ ئەندامەکی چست و چەلەنگ و کەدکەر و ب هێز بت د جڤاکێدا، و ب سەرفرازی و سەربلندی بژیت. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( المؤمن القوي خيرٌ وأحبُّ الى الله من المؤمن الضعيفِ )) ئانکو: پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: باوەردار خودان هێز و شیان، ل دەڤ خودێ، ژ باوەردارێ بێهێز و لاواز چێتر و خوەشڤیترە. ژ بەر هندێ، ئەرکێ مە هەمییانە کو ئەم ل بەر ڕۆناهیا هەق و دادپەروەرییێ ل سەرەکانی و ژێدەرێن هێزێ بگەڕین و سەخمەراتی ب دەستڤەئینانا وان ئەم حەز ژ کارکرن و بزاڤێ بکەین.

**٢- مافێ مرۆڤی د دابینکرنا دەلیڤەیێن کاریدا:**

ئیسلام دبینت کو ئەرکێ دەولەتێیە دەلیڤەیێن کاری بۆ وەلاتییان دابین بکەت، دا شیانێن وان یێ جودا و ڕەنگڕەنگ بێختە د مەیدانا کاریدا، و سەرەکانی و ژێدەرەکێ بۆ ژین و ژیارەکا پاك و پاقژ ب دەست خوەڤە بینن، و دا شیانێن وان بۆش و بەلاش نەچن، و نەبنە بارەکی گران ل سەر پشتا جڤاکێ و چاڤێ وان نەمینتە ل دەستێ خەلکی.

**٣- مافێ پالە و کرێکاری د وەرگرتنا هەقێ کەدا خوەدا و ل وەخت و بێ پاشئێخستن:**

ئیسلامێ پێدڤی کرییە ل سەر خودانێ کاری، کو بەری دەست ب کاری بێتە کرن، هەقێ کەدا کرێکاری بێتە دیارکرن و پشتی تەمامبوون و ب دووماهیهاتنا کارێ وی، یان ژی ل وەختێ تفاق ل سەر هاتییە کرن، بێ پاشئێخستن، هەقێ کەدا کریکاری بدەتێ، ژ کیس پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ڤەدگوهێزن و دبێژن: (( نهى رسول الله ( ﷺ ) عن استئجار الأجير حتى يبين له أجره )) ئانکو: پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) فەرمان کرییە کو بەری ب کرێگرتنا کریکار و پالەیی، پارەیێ کەدا وی بێتە دیارکرن، دا ستەم لێ نەئێتە کرن و مافێ وی نەئێتە خوارن و پێك و پەیسکا وان یا جڤاکی خراب نەئێتە کارئینان.

هەر وەسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( اعطوا الاجير اجره قبل ان يجفَّ عرقه )) ئانکو: بەری خوها پالە و کرێکاری هشك ببت، پارە و هەقێ وی بدەنێ، چونکی پشکەك ژ کرێکاران، داهاتییێ وان ڤەبڕییە، و د بازارا کاریدا، ب هیڤیا کەدا ڕۆژانەیا دەستێ خوەڤەنە.

هندەك ژ زانایێن شەریعەتزان ل وێ باوەرێنە، کو ئەگەر خودانکارەك ل بەر پارەیێ کرێکاران ئاسێ ببت و نەدەت، هنگێ ئەو تشتێ کرێکاران شۆل تێدا کری، دەمانێ پارە و هەقێ وانە. کرێکار بێ کو ل دادگەهێ بزڤرت، دشێت پۆلیسان بینت و وی تشتی بفرۆشت و پارەیێ خوە ژێ ڕابکەت، و د هەمی ڕەوشاندا ژی، دادگەه ڕێکێ نادەت کو پارەیێ چو کرێکاران بێتە خوارن، و د دەمێ بلندکرنا گازندەیا یاساییدا ژی، ل سەر نەدانا کرێ یان پارەیی، دڤێت باج و پارەیێ پارێزەری ژی و هەر ئەرکەکی دی ژی بکەڤتە سەر خودانێ کاری.

**٤- دابینکرنا هەیڤانەیا فەرمانبەران و کرێیا پالەیان ب ئاوایەکێ کو پێڤییێن ژیانەکا ناڤنجی بۆ وان دابین بکەت:**

دادپەروەری کو بهایەکی مەزنی ئیسلامێیە، هندێ دخوازت، کو کرێیا هەر کەسەکێ د گەل گرنگیا کارێ وی گونجایی بت، و ب کێماسی ژین و ژیارەکا پاك و پاقژ ب دەست خوەڤە بینت. چونکی کرێیا کێم ل دەڤ

هندەك كەسان، دێ بتە ژێدەرێ بەرتیل و دزییان ژ مالێ گشتی، كو ئەڤە ژی بێگومان، گونەهن و جزایێن یاسایی و قانوونی ل سەر هەنە.

كرێیا ژ هەمییان كێمتر د ئیسلامێدا، ئەوە یا پێڤی و وەجێن بنەڕەتێن مرۆڤی بەردەست دكەت، هەر كرێكار و فەرمانبەر و مرۆڤەك د دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێدا، مافێ وییە مال و هەڤسەر و ئالاڤێ هاتن و چوونێ و ژێدەرێ ژین و ژیارا ڕۆژانەیا خوە هەبت.

هەر وەكی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەكێدا دبێژت: (( مَنْ ولي من امرنا، وليس له منزلٌ فليتخذنَّ منزلاً، او ليس له زوجة فليتزوج، او ليس له خادم فليتخذ خادماً، او ليس له دابة فليتخذ دابّة، فمن اتخذ سوى ذلك، جاءِ يوم القيامة غالاً مسرفاً )) ئانكو: هەر كەسێ كارەكی مە پێ هاتە سپارتن، و خانی نەبوو، بلا خانییەك بۆ بێتە دابینكرن، و ئەگەر هەڤسەر نەبوو، بلا هەڤسەرێ پەیدا بكەت، و ئەگەر هۆكارێ هاتن و چوونێ نەبوو، بلا دابین بكەت، هەر كەسەكێ ژ ڤان زێدەتر ببەت، ڕۆژا قیامەتێ، دێ ل سەر خیانەتكار و دەرێژكاران ئێتە هەژمارتن.

ئەبی عوبەیدە ژی كو ئێك ژ هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەری بوو (سلاڤ لێ بن) شیرەتێ ل عومەرێ كوڕێ خەتتاب دكەت، و دبێژت: (( اذا استعملتم فاجزل لهم العطاء فلا يحتاجون )) ئانكو: ئەو كەسێن هوون د كار و بارێن خوەدا ب كار دئینن، هند بدەنێ كو پێڤی و وەجێن وان پێ بێنە ڤەتاندن و دەستتەنگ نەمینن.

**٥ - دەستگرتنا كرێكاران ب ڕێكا قەر و دەین و دانان:**

شێوازەكی دی د ئیسلامێدا ژ بۆ بەردەستكرن و پەیداكرنا دەلیڤەیێن كاری و دانەكارا پالەیان، ئەوە وەك دەستگرتن، ئالاڤ و ئامووەرتێن كاركرنێ یێن پێدڤی بۆ كەسێن پیشەكار و شارەزا د كار و پیشەیەكا دەستنیشانكریدا بێنە كڕین و بەردەستكرن. ئیمامێ غەزالی ل وێ باوەرییێ، كو ئەركێ حوكمەتێیە، پەرگالێن كاری بۆ ڤان كەسان دابین بكەت، و هاریكارییا جۆتیار و خودانكاران بكەت، و پشتا وان بگرت، هەر وەكی پڕانییا حوكمەتێن خزمەتكارێن ئەڤرۆ ب ڤی كاری ڕادبن.

ئیمام غەزالی د ڤێ بیر و بۆچوونا خوەدا، پشتا خوە ب فەرمۆدەیەكا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ڤاهیم كرییە، كو ڕۆژەكێ زەلامەك دئێتە دەڤ و گازندەیا دەستتەنگییا خوە بۆ دكەت، ئەو ژی دو دەرهەمان ددەتێ و دبێژتێ: (( كُل باحدهما، واشترِ بالآخرِ فأساً فاعمَلْ بِها )). ئانكو: ب دەرهەمەكێ خوارنێ بكڕە، و ب یێ دی بڤرەكێ بكڕە و پالەتییێ بۆ خوە پێ بكە.

زانایێ مەزنێ موسلمان، قازی (ئەبوو یووسف)، كو ئێك ژ هەڤالێن ئیمام (ئەبوو حەنیفە) بوو، دبێژت: ((ئەگەر خودانزەڤییەك ژ دەستتەنگی و خیزانی نەشێت زەڤییا خوە تۆڤ بكەت و بچینت، دڤێت بەیتولمال - كو ئەڤرۆ بەنكا كشتوكالییە -هاریكارییەكێ بۆ بكەت، دا بشێت زەڤییا خوە بەركێل بكەت و شۆل تێ بكەت)). ئەڤە ژی وێ ڕامانێ ددەت، كو ئەركێ دەولەتێیە، هاریكارییا جۆتیار و پیشەكاران بكەت، و دەستێ وان ب دەین و قەران بگرت، دا بشێن پێڤی و وەجێن كارێ خوە دابین بكەن، و بێ كار نەمینن.

**٦ - مافێ بێکارانە، هەتا کارەك ب دەست وان دکەڤت، دەمانا جڤاکی وەربگرن :**

ڕەوشا ئاسایی ئەوە ژیانا مرۆڤی ل سەر کار و وەستیانا مرۆڤی ب خوە بت، ئەگەر کار ژی ب دەست نەکەڤت، دڤێت دەولەت پێکۆلێ بکەت دەلیڤە و دەرفەتا کاری بۆ ببینت، هەلبەت -وەکی د وەلاتێ مەدا بەلاڤ -مەرج نینە ب دامەزراندنێ بت د فەرمانگەه و دەزگەهێن حوکمەتێدا، ئەگەر دەولەتێ نەشیا دەلیڤەیا کاری بۆ پەیدا بکەت، هنگێ ئەرکێ وێ و یێ هەمی جڤاك و ڕێکخستییێن جڤاکی، د دەمێ بێکارییا هەر وەلاتی و مرۆڤەکێدا ئەوە، دەمانا جڤاکی بدەتە وان، ژ بۆ هاریکاریکرن و دابینکرنا پێڤی و وەجێن ژین و ژیارا وان یێن فەر. چونکی هەر کەسەکێ مافێ ژیانێ و پارستنا کەرامەتێ هەیە و پارسەکی و دەرۆزەکرن د ئیسلامێدا حەرامە، و نابت ڕێك بۆ بێتە ڤەکرن.

(ئیبن عابدین)ێ زانا و شەریعەتزان د ڤی واریدا دبێژت: (( للقاضي ان يلزم ولي الأمر بالانفاق على الفقير العاجز )) ئانکو: دادگەهێ ماف هەیە دەولەتێ نەچار بکەت، کو خەرجییەکێ بۆ ژار و دەستتەنگێن کەڤتی و شۆل پێ نەقەت ڤەبرت، ئەوێن ژ بەر هەر ئەگەرەکێ شیانا کارکرنێ ل دەڤ وان نەمایی.

زانایێ ناڤدار (ئیبن تەیمییە) ژی دبێژت: ((ئەگەر زەکاتێ تێرا ژار و دەستتەنگان نەکر، ژ ئەرکێ دەولەتێیە، پێڤی و وەجێن فەر بۆ وان پەیدا بکەت، ڤێجا ئەگەر کار ب دەستێن دەولەتێ ئەڤە نەکرن، مافێ کەسێن پێڤی و هەوجەیە، گازندەیا خوە بەرانبەری دادگەهێ ل سەر دەولەتێ و کار ب دەستان تۆمار بکەن)).

**٧- ژین و ژیارا باش و پاقژ مافێ هەر مرۆڤەکێیە :**

ئیسلام د گەل هندێیە، کو دەولەت بێ جودایی، ژین و ژیارەکا پاك و پاقژ بۆ هەر وەلاتییەکێ دابین بکەت. پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و خەلیفەیێ وی ئەبووبەکرێ سددیق (خودێ ژێ ڕازی ببت) ب یەکسانی و وەکهەڤی داهاتێ دەولەتێ ل سەر خەلکی بەلاڤ دکر، چونکی هەر وەکی عومەرێ کوڕێ خەتتاب (خودێ ژێ ڕازی ببت) د ئاخفتنەکا خوەدا دبێژت: (( واللهِ الذي لا اله الا هوَ ما احدٌ الا وله في هذا المالِ حقٌّ، وما أحدٌ أحقُّ به مِنْ أحدٍ، وما أنا فيه الا كأَحدِهم )) ئانکو: سووند ب خودایێ تەك و ب تنێ، هەر کەسەکێ بار د ڤی مالیدا هەیە (مالێ دەولەتێ) کەس ژی د ڤی واریدا ژ کەسێ چێتر و هێژاتر نینە، ئەز ب خوە ژی د ڤی واریدا وەکی هەر ئێك ژ خەلکیمە. ئەڤە ب کورتی وێ ڕامانێ ددەت، کو داهاتێ گشتی بێ جودایی مافێ هەر کەسێ تێدایە. د سەردەمێ خەلیفەیێن ڕاستەڕێدا، ژ بلی هندێ کو مەزنان بارا خوە هەبوو، زارۆکێ ژ نوو ژی ب سەر دنیایێ دکەڤت، بارا وی ئێکسەر د بەیتولمال (بيت المال)دا یان هەیڤانەیا وی دهاتە دیارکرن.

**٨- مافێ خودان پێڤیێن تایبەت د دەمانا جڤاکیدا (د کەفالەتکرنێدا) :**

پێشتر مە دابێشا هندێ کر کو دڤێت مرۆڤ ب خوە کار بکەت، دا پێڤی و وەجێن ژین و ژیارا خوە دابین بکەت، و ئەگەر کار ب دەست نەکەڤت، ئەرکێ دەولەتێیە ئالاف و پەرگالێن کارکرنێ یان دەلیڤە و دەرفەتا کاری ب خوە بۆ دابین بکەت، ئەگەر ئەڤە ژی نەهاتە کرن، دڤێت هەتا کار ب دەست دکەڤت، دەولەت وی و مالا وی خودان بکەت و سەرەگوهییا وان بکەت، ئەوا نها دبێژنێ (دەمانا جڤاکی) بدەتێ، نها ئاخفتن ل سەر هندێیە، ئەرێ ئەگەر دەولەتێ شیانا هندێ نەبت، بێکار و مرۆڤێن بێچارە و ژ کارکەڤتی خودان بکەت، دڤێت

چ بێته کرن؟ ئەڤ بابەتە هەر ژ کەڤندا ژ بەرێ زانایێن موسلمانڤە هاتییە ڕۆنکرن، کو د هەر دەمەکێدا دەولەتێ پێڤە نەئێت، ب ڤی ئەرکی ڕاببت، بەرپسیاری دکەڤتە بەرێ فەرمانگەه و دەزگەهێن جڤاکێ، و ژ وان ژی، نەمازە تەخا دەولەندێن جڤاکێ. زانایان د ڤی واریدا گۆتییە: ئەگەر زەکاتێ و بەنکا مەرکەزی شیانا دابینکرنا پێڤی و وەجێن زار و خودان پێڤییێن تایبەتێن جڤاکێ نەما، هنگێ دڤێت دەولەمەند و ڕێکخستییێن خێرخواز، پێڤی و وەجێن وان یێن بنیاتی دابین بکەن، وەکی ئاڤاهی و جهێ ڤەحەویانێ و خوارن و ڤەخوارن و جلکان و چاڤدێرییا ساخلەمییێ.

ب کورتی، کارکرن د ئیسلامێدا ژ بهایێن بلندە، و ئیسلام بەردەوام بەرێ مە ددەتە کارکرنێ، و مرۆڤی مافێ کارکرنێ هەیە، و ئەرکێ وییە کو کار بکەت و شیانێن خودێ داییێ ب کار بینت، و کەسێ ژی ئەو ماف نینە ب کۆتەکی کارەکێ ل سەر بسەپینت، چونکی د ئیسلامێدا، سوخرە و کارێ ب زڕەتۆپزی ژی قەدەغە و حەرامە. ژ ئالییەکی دیڤە، دڤێت مافێن پالە و کرێکاران ب جوانی بێنە پارزتن، هەر ژ بەر هندێ، گیانێ ئیسلامێ و ڕێ و نیشانێن وێ، د ڤی سەردەمیدا، د گەل هندێنە، کو یاسایەکا کاری یا دادپەروەرانە سەر پێ ببت، و کار و دەمانا جڤاکی و چاڤدێرییا ساخلەمی و ژین و ژیارەکا پاك و ب ڕوومەت و خوەش، ئەڤە هەمی بۆ سەرانسەری کرێکار و فەرمانبەران بێنە دابینکرن.

### پسیار:

١– ئەرێ مافێ کارکرنێ د ئیسلامێدا، ب تنێ هەڤبەندی ب هەبوونا کاریڤە هەیە بۆ مرۆڤی؟

٢– ل دووڤ بەرێخوەدان و دیتنا ئیسلامێ، بەرپسیارییا جڤاکێ بۆ نەهێلانا دەستتەنگی و بێکارییێ چیە؟

### دان و ستاندن:

ئەرێ ئەڤرۆ، هەلوێستێ ئیسلامێ، چ هەڤبەندی هەیە بەرانبەری ئازادییا کارکرنێ و **دەمانا جڤاکی**؟

## وانەیا شازدەیێ

### ٧- مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسی :

ئەگەر کەرامەتا مرۆڤاتییێ بنسترا مافێ تەکمرۆڤان بت، ئانکو ئەو بەرێ بنیاتێیە بۆ ماف و ئازادییا مللەتان، چونکی ئەندامێن مللەتێ بندەست و بێماف، نەشێن وەك مرۆڤ هەست ب کەرامەت و سەربلندییێ بکەن، ژ بەر هندێ، مافێ گەل و مللەتان، د بڕیاردانا مافێ چارەنڤیسێ خوەدا و یەکسانبوونا وان د گەل ئێکدو و سەرەدەرییا مرۆڤانە د گەل وان، پشکەکە ژ مافێن مرۆڤی و پارستنا کەرامەتا وی ژ بریندارکرن و سڤك بەرێخوەدانێ.

بەلگەنامەیا نەتەوەیێن ئێکگرتی ژی، ئەڤ مافە هەڤاندییە، و ئیشارەت داییە هندێ، کو ئێك ژ مەرەمێن وان مللەتێن (ڕێکخستییا مللەتێن ئێکگرتی) پێکئینایی، ئەوە هەڤبەندییێن هەڤالینییێ ل سەر بنیاتێ مافێ یەکسانییێ، د ناڤبەرا هەمی مللەتاندا بێنە پێشخستن و هەر ئێکێ مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسێ خوە هەبت.

مادەییا ئێکێ ژ هەردو پەیماننامەیێن ناڤدەولەتی، ئەوێن تایبەت ب مافێن مەدەنی و سیاسی و ئابۆری و جڤاکی و کلتۆریڤە، ئەڤ مافە ڕۆنکرییە و دبێژت: ((هەر مللەتەکێ مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسێ خوە هەیە، و ل دووڤ ناڤەڕۆکا ڤی مافی، وی مافێ بڕیاردانا پێك و پەییسکا سیاسی و ئازادییا دەمانکرییا خوە هەیە، مافێ دابینکرنا وەرارا ئابۆری و جڤاکی و ڕەوشەنبیرییا خوە هەیە)).

مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسی ژی، پێکهاتییە ژ هندێ، کو هەر مللەتەك -ب ئیرادەیا ئازادییا خوە و دووری هەر پێپەست و زۆرلێکرنەکێ، بڕیارا پێك و پەییسکا خوە یا سیاسی، و هەڤبەندییا خوە ب گەل و مللەتێن دیڤە، و سیستەمێ فەرمانڕەواییا خوە، بدەت.

و مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسی ژی، ل سەر سێ جوونان دئێتە پشککرن:

١- ئێکگرتنا ب ڕەزا خوە ئانکو (فیدرالی).

٢- خوە دانە د گەل دەولەتەکا دی (ئێکگرتنا دو پشکێن مللەتەکێ).

٣- دامەزراندنا دەولەتا خوەسەرا نەتەوەیی.

### ئیسلام و مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسا مللەتان

ئاشکەرایە کو د دەمێ هاتنەخوارا قورئانێدا، زاراڤێ (مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسێ) چو بەحس و خەبەر نەبوون، و هەبوونا خوە ژی ل سەر ڕوویێ ئەردی نەبوو، چونکی مافێ ژێگۆتی، پشتی سەرهلدانا هزرا نەتەوەیی نەمازە پشتی شۆرەشا فەرەنسا ل ئەوروپا و ئاشکەراتر ل سەدسالا نۆزدە و دەستپێکا سەدسالا بیستێ پەیدابوو، بەلێ ئەڤە ڕامانا هندێ نادەت، کو مە شیان نینە، ل دووڤ بهایێن بلند و بنەمایێن گشتییێن ئیسلامێ د ڤی مافی بگەهین.

ئەگەر ئەم ل قورئانا پیرۆز بزڤڕین، هەر وەکی پێشتر مە گۆتی، ئەم دێ زانین، کو مرۆڤ ل سەر ڕوویێ ئەردی سەردار و سەروەرێ خوەیە و ئازادییا وی د دەست وی ب خوەدایە. ئەڤ سەرداری و سەروەرییا مرۆڤی ژی، ژ هندێ هاتییە، کو خودایێ مەزن ئەو ژ بۆ ئاڤاکرنێ کرییە جهگرێ (خەلیفەیێ) خوە ل سەر ئەردی، و ئیرادە و شیانا هلبژارتنێ داییێ: (( وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ... )) (البقرة ٣٠). ئانکو: مە مرۆڤ د ئەردیدا کرییە جهگر (خەلیفە).

هەر وەسا خودایێ مەزن مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسێ مرۆڤی و هەڤبەندییا وی د گەل غەیری وی و د گەل خودێ، کرییە د دەست وی ب خوەدا، هەر وەکی د قورئانێدا هاتی: (( إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا )) (الأنسان ٣). ئانکو: مە بەرێ مرۆڤی داییە ڕێکا ڕاست، ئەو ژی - ب ئیرادە و ڤیانا خوە ئازادە، ڕێبازا باوەڕ و سوپاسگوزارییا پەروەردگاری، یان یا بێباوەری و نەسوپاسگوزارییێ بدەتە بەر خوە و هلبژێرت.

مافێ هلبژارتن و بڕیاردانا چارەنڤیسی ئەڤێ هە، کا چاوا ئەو مافێ مرۆڤەکێیە، ئەها وەسا مافێ کۆم و گرۆپ و مللەتانە ژی، چونکی خودایێ مەزن ئازادی داییە نفشێ مرۆڤی، و هندی مرۆڤە، ئێك ژ پێکهاتێن بنەمال و مللەتانە.

ل ئێرە پسیار ئەڤەیە: ئەگەر خودایێ مەزن د نازکترین تشتدا، و د ئێك ژ گرنگترین چەسپایی (ثوابت) یێن دینیدا، کو باوەرە، ئەو ئازادییە دابتە مرۆڤی، کو باوەرێ بینت یان نەئینت، و کەسێ ماف نەبت زۆری و کۆتەکییێ لێ بکەت، چونکی زۆری و کۆتەکی د دینیدا قەدەغەیە: (( لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ... )) (البقرة ٢٥٦)، پا بۆ مەسەلەیەکا سیاسی، وەکی ژیانێ د چارچوۆڤێ دەولەتەکا دەستنیشانکریدا، کو سیستەمێ سیاسی و فەرمانڕەوایی ئێکە ژ گوهارتییان (المتغيرات) و هەڤبەندی ب پێشکەڤتنا مرۆڤیڤە هەیە، د چارچوۆڤێ بهایێن دادپەروەری و شوورا و ئازادی و یەکسانییێدا، ئەرێ ما بەرئاقلە زۆری و کۆتەکی ل مللەتان بێتە کرن، کو بێ ڕەزا خوە د ناڤ قەوارەیەکا سیاسییا دەستنیشانکریدا بژین؟

ئاشکەرایە، ئیسلام د ڤی واریدا، ڕێزێ ل وێ ئیرادەیێ دگرت ئەوا خودێ داییە مرۆڤان، ل دەڤ خودایێ مەزن تشتێ گرنگ ئەو نینە، کو مللەتان دەولەتێن خوەسەرێن خوە هەبن، یان ب ئیرادە و ڤیانا خوە، و د چارچوۆڤێ سیستەمەکی فیدرالیدا، بڕیارا پێکڤە ژیانێ بدەن، بەلکو تشتێ گرنگ ئەوە، بهایێن ئیسلامی، ئەوێن وەکی دادپەروەری و کەرامەتپارێزی و دژمناهییا ستەمێ و شوورا و ئازادی و یەکسانی، بێنە سەرپێکرن. ل دووڤ بەرێخوەدانا ئیسلامێ، ڕەوایییا خوندکاری (الحكم) و خوندکاران (الحكام)، ب (گرێبەست)ەکێڤە گرێدایییە، ژێدەرێ وێ مللەت و وەلاتینە، و مللەت ژێدەرێ بڕیارێیە، و کەسێ ماف نینە ژ دەرڤەیی ئیرادە و ڕازیبوونا مللەتی، خوە ل سەر بسەپینت.

ئانکو بەری هەر تشتەکێ، دڤێت ڕاپرسی د ناڤبەرا مللەتێن جودادا بێتەکرن، نەمازە ئەوێن هەتا نها ژی نە خودانێن قەوارەیا خوەسەرا خوە، دا بێتە زانین، کا وان دڤێت د چارچوۆڤێ ڤان دەولەتێن نهادا بمینن، یان

ژی دخوازن ژێ جودا ببن، و قەوارەیا خوەسەرا خوە پێك بینن، بەروڤاژی ڤێ ژی، کارئینانا هێزێ ژ بۆ تەپەسەرکرنا مللەتەکێ و ب زۆر هێلانا وی د چارچوڤێ دەولەتەکێدا، و زڕبارکرنا وی ژ مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسێ خوە، دژی گیانێ ئیسلامێ و بهایێن وێ یێن بلندە، و ژ وان ژی، بهایێ دژمناهییا ستەمێ و دانەپاشا زۆرداری و دەلمدارییێ (الاضطهاد).

چونکی ئیسلام، د هەر چارچوڤ و قالبەکێ، دژمناهییا ستەم و دەلمدارییێ دکەت، دژمناهییا زڕبارکرنا مللەتان ژ مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسێ وان دکەت، دژمناهییا ڕێزنەگرتنا وێ ئیرادە و ڤیانا خودێ داییە وان دکەت، و گەلەك جوونێن ستەم و خرابکارییان ژ ڤان دەردکەڤن، و ب ڤی ڕەنگی و ل دووڤ بنەما و بهایێن ئیسلامی، بۆ مە دیار دبت کو دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێ د ڤی واریدا، د گەل مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسا مللەتان و یەکسانییا وانە.

**پسیار:**

١- ل دووڤ دیتن و بەرێخوەدانا ئیسلامێ، ئەم چاوا ناڤەڕۆکا مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسی ببینین؟

٢- د ئیسلامێدا، ل سەر کیژان بنستەرێ، مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسی، بۆ مللەتان هاتییە ئێخستن؟

**دان وستاندن:**

د ئیسلامێدا، مافێ بڕیاردانا چارەنڤیسی، چ هەڤبەندی ب چەمکێن (براتی) و (یەکسانی)ییێڤە هەیە؟

## وانەیا هەڤدەیێ

## بهایێن ئیسلامی

**ئێك - دان و ستاندن:**

دان و ستاندن بهایەكی ئیسلامی و مرۆڤاتییە، مرۆڤ دشێت ب ڕێكا وێ سەرەدەرییەكا ڕاست و دورست د گەل دەور و بەرێ خوە بكەت، و بەرێ مللەت و جڤاكان ژی ددەتە كێلك و گوپیتكا پێشكەڤتن و تەكوزییێ.

### گرنگییا دان و ستاندنێ د ئیسلامێدا

دان و ستاندن ڕێبازا سەرانسەری پێغەمبەرێن خودێ بوو (سلاڤ ل وان بن)، دەمێ بۆ خێر و قەنجی و خودێپەرێسییێ گازی مللەتێن خوە دكرن. د ئیسلامێدا گەلەك پووتە پێ هاتییە كرن و ئێكە ژ پێك و پایەیێن ڤی دینێ خودایی.

خودایێ مەزن دان و ستاندن د گەل ملیاكەتێن خوە كرییە، و د گەل ئادەم (سلاڤ لێ بن) كرییە، دەمێ فەرمانا وی ب جه نەئینایی و ژێ دەركەڤتی، هەر وەسا د گەل شەیتانی ژی كرییە، دەمێ بێئەمرییا وی كری، و هەتا د گەل گاور و بێباوەر و خودێنەناسان ژی دكەت، بەری ئیزایێ ب سەر واندا داڕێژت. دان و ستاندن، ڕێبازا پێغەمبەری ژی بوو (سلاڤ لێ بن) ژ بۆ گەهاندنا پەیاما خوە و سەرەدەریكرنێ د گەل دووكەڤتییێن ئایینێن دی و ئەوێن ل دەر و دۆرێن خوە، چونكی ئیسلامێ چو جاران ترس ژ دان و ستاندنا ئازاد و ئازادییا ڕادەربڕینێ ڕانەكرییە، و هەردەم ب هێز بوو، هەتا د بن سیبەرا ڤان سەقایاندا، پتر بەلاڤ دبوو، و دلێ گەلەك خەلكی زێدەتر ب نك خوەڤە دكێشا.

### گرنگییا دان و ستاندنێ د ژیانێدا

د ژیانا مللەت و جڤاكاندا، دان و ستاندنێ گرنگییەك مەزن هەیە، ل ئێرە ئەم دێ ب تنێ بەحسێ دوو ئالییان ژ وێ گرنگییێ كەین:

١- دان و ستاندنا ل سەر خوە و ڕژد، دەورەكی مەزن د چارەسەركرنا ئاڕێشە و گرفتارییاندا هەیە، ئەو ژی ب ڕێكا كێمكرنا جودایی و نەلێكییان و كۆمكرنا دلان و بەرفرەهكرنا چارچۆڤێ پێكهاتنێ د ناڤبەرا ئالییێن نەلێك و جودادا.

٢- موكومكرن و قاهیمكرنا كارێ هەڤپشك و كووركرنا براتی و پێكڤەژیان و لێبۆرینێ د ناڤبەرا ئایین و مللەت و جڤاكاندا، سەخمەراتی ئاڤاكرنا گەش و خوەشا هەڤپشك بۆ هەمییان.

### دان و ستاندن چیە؟

دان و ستاندن، گوهۆڕین و پێداچوون بیر و بۆچوون و ئاخڤتنێیە د ناڤبەرا دو ئالییاندا، ب مەرەما گەهشتنا كۆمەكا خالێن هەڤپشك د سەقایەكێدا، كو تێر و تژی بت ژ تەناهی و هەڤسەنگییێ.

## دان و ستاندن و هەڤبەندییا وێ ب جوداهییێڤە

جودایی د ناڤ جڤاکێ مرۆڤاتییێدا، ئێکە ژ یاسایێن خودایێ مەزن د ڤێ ژینێدا، چونکی گەلەك ب زەحمەتە خەلك هەمی ل سەر ئێك ئاوایێ ژیانێ و هزرکرنێ کۆم ببن، ژ بەر هندێ هندی ژیان ل سەر ڕوویێ ئەردی بمینت، جودایی ژی هەر دێ مینت. قورئان ژی د ڤی واریدا دبێژت: (( **وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ** )) (هود ١١٨) ئانکو: (هەی موحەممەد) ئەگەر پەروەردگارێ تە ڤیابایە، دا سەرانسەری خەلکی کەتە ئێك مللەت و ل سەر ئێك ڕێبازێ کۆم کەت، بەلێ ئەو (خەلك هەتا ئەڤرۆ ژی) هەر جودانە، ئیمامێ ڕازی دبێژت: ((مەخسەد جوداییا خەلکییە د ئایین و ڕەوشت و کار و ڕەفتاراندا)).

دیارە د سەر باوەریبوونێرا ب دان و ستاندنێ، جودایی و گەلەئایینی و نەتەوەیی و سیاسی و ئابۆری و ڕەوشەنبیری، نەکو نابتە ژێدەرێ خرابییێ، بەلکو دبتە هۆکارەکی گرنگ بۆ دەولەمەندبوونا شارستانی و جوانترکرنا ژیانێ.

## دان و ستاندن د قورئانێدا

قورئانا پیرۆز باوەرداران پال ددەت دا د گەهاندنا پەیامانددا پشتا خوە ب دان و ستاندن و قەناعەتپێکرنێ گرێبدەن، و ل سەر وان قەدەغەکرییە کو ب زۆر بیر و باوەران ل سەر کەسێن دی بسەپینن. ژ ڤی ئالیڤە گەلەك نموونەیێن دان و ستاندنێ د گەل جودا و نەیاران پێشبەری مە کرینە، دا باوەردار مفایی ژ ڤان نموونەیان وەرگرن، و ئەو ژی بشێن ئارێشە و گرفتارییێن خوە ل ناڤ خوە ب خوەدا و ژ دەرڤە ب دان و ستاندنێ چارەسەر بکەن، و خوە ب چو ڕێبازێن دی نەکەن هندی بشێن، و دیارە خودایێ مەزنخودان دەستهلاتەکا بێ سینۆرە و گەلەك ب سانەهی دشیا ئەوێن دژی وی ڕادوەستن و نەیارییا وی دکەن، نەکو بەس بێدەنگ بکەت، بەلکو وان ژ هەبوونێ ڕاکت و پووچ بکەت، بەلێ خودایێ مەزن وی کاری ناکەت و ب ڤێ چەندێ ژی دڤێت مە وەسا تێ بگەهینت کو ڕێکا سروشتی بۆ چارەسەرکرنا ئارێشەیان و سەرەدەریکرنێ د گەل ئەوێن ژ مە جودا، چ جوداییا ئایینی بت، یان یا نەتەوەیی و سیاسی یان یا هەر تشتەکی دی، ئەو دان و ستاندن و پێکهاتنە.

گرنگیدانا قورئانێ ب دان و ستاندنێ د ئاستەکێدا کو (١٧٠٠) جاران ب شێوە و ئاوایێن ڕەنگڕەنگ ئیشارەت پێ کرییە. قورئان چیرۆکا گەلەك پێغەمبەرێن خودێ بۆ مە ڤەدگوهێزت، کا چاوا ڤیایینە ب ڕێکا دان و ستاندنێ و ئاوایێ ئاخاڤتنا جوان، قەناعەتێ بۆ مللەتێن خوە چێ بکەن و پەیاما خودێ بگەهیننە وان.

هەر وەسا قورئان گازی دووکەڤتییێن ئایینێن ئەسمانییێن دی دکەت ژ بۆ ل سەر هندەك خالێن هەڤپشك کۆم ببن، کو د بنیاتدا هەمی دین و ئایین تێدا هەڤپشکن: (( **قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ** )) (آل عمران ٦٤). ئانکو: گەلی خودان کتێبان، وەرن دا ئەم و هوون ل سەر ئاخفتن و گەلەك

مەسەلەیێن هەڤپشك د ناڤبەرا مەدا كۆم ببین، كو بۆ مە هەردو جوونان وەكی ئێكن، ئەو ژی ئەڤەنە: ئەم كەسێ بۆ خودێ نەكەینە هەڤپشك، و ژ بلی خودێ كەسێ دی نەكەینە خوداوەند، كو دەستهلاتەكا نیڤ ڕەها بدەینێ و مە ڕسوا بكەت، و چ یێ بڤێت ب كەیفا خوە بكەت.

## پێدڤییێن دان و ستاندنا سەركەڤتی

ژ بۆ كو گەنگەشە و دان و ستاندن سەركەڤتی بت، دڤێت ئالییێن پشكدار چەند بنەمایەكان بیننە بەر چاڤێن خوە و ژ وان:

**١- ئاخفتن ب ئاوایەكی زانستی و بابەتەكی بت:**

فەرە ئالییێن پشكدار بەری خوە ب دان و ستاندنێ بكەن، خوە باش بۆ كارخوەش بكەن، و دڤێت هەمی ڕەخ و ڕوویێن بابەتێ دان و ستاندنێ و ئارمانجێن وی ل دەڤ وان ڕۆن و ئاشكەرا بن، و هەر ئالییەك باش د یێ دی بگەهت، قورئان د ڤی واریدا دبێژت: (( **قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ** )) (البقرة ١١١) ئانكو: ئەگەر هوون د داخوازا خوەدا ڕاست دبێژن، كا بەلگە و نیشانا خوە دیار بكەن، هەر وەسا قورئان دبێژت: (( **وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً** )) (الإسراء ٣٦) ئانكو: تشتێ تە زانیاری ل سەر نەبن و تو باش تێدا شارەزا نەبی و چو ژ ڕاستیيا وی نەزانی، ل سەر ڕانەوەستە و باوەرییێ پێ نەئینە و پشتا خوە پێ گرێنەدە.

**٢- گەهشتنە وێ ڕادەیا تێگەهشتنێ كو جودایی یاسایەكا گەردوونییە:**

وەكی مە پێشتر گۆتی، خودایێ مەزن مرۆڤ ب گەلەك ڕەنگ و زمان و مللەتێن جودا جودا چێكرینە، ئەڤە هەمی ژی وێ ڕامانێ ددەت، كو جودایی و گەلەڕەنگی ڕەوشا سروشتییا ژیانێ و بوونەوەرییە، و دڤێت ڕێز لێ بێتە گرتن. هەر كەسەكێ ل بەر بگەڕت ب دارێ زۆرێ جوداییێ نەهێلت، ئەو دژی ئیرادە و ڤیانا خودایێ مەزنە، چونكی هەبوونا ڤان جوداییان، ژ چارچۆڤێ حەزكرنا خودێ دەرناكەڤت: (( **وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ** )) (الروم ٢٢) ئانكو: ئێك ژ نیشانێن خودایێ مەزن، چێكرنا ئەسمانان و ئەردی و جودایيا ڕەنگ و زمانێن هەوەیە، ئەڤە ژی بەلگە و نیشانن بۆ كەسێن زێدەزانا. فەرە خالا دەستپێكرنا دان و ستاندنێ ژ بەرێ ئالییێن تێدا پشكدار، هەڤاندنا جوداییێ بت، جودایيا د ناڤبەرا خوە ب خوەدا بهەڤینن و ل دووڤ كۆمەكا خالێن هەڤپشك بگەڕن، دا ل سەر پێك بێن.

**٣- زۆری لێنەكرن:**

ئێك ژ مەرجێن بنیاتی یێن دان و ستاندنێ، ئەوە هەردو ئالییێن تێدا پشكدار، د دەربڕینا بیر و بۆچوونێن خوەدا، د وان تشتاندا ئەوێن ل سەر پێك دئێن، ئازاد بن. كەسێ ژ هەردو ئالییان ئەو ماف نەبت زۆری و كۆتەكییێ ل یێ بەرانبەر بكەت یان بترسینت. خودایێ مەزن دبێژت: (( **لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ...** )) (البقرة ٢٥٦). هەر وەسا دبێژت: (( **... وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ** )) (ق ٤٥). ئانكو: هەی

موحەممەد تو نە زۆرداری ل سەر سەرێ وان، هەتا تشتێ پێ ڕازی ژی نەبن، تو ب کۆتـەکی ب وان بدەیـە کـرن، ب قورئانێ ڕاستییان بینە سەر هزرا وان کەسان ئەوێن ژ گەفێن خودێ و ڕۆژا دووماهییێ دترسن.

دیار و ئاشکەرایە کو خودێ د گەل هندێ نینە، خوە بۆ گرتنا ڕێکا دینێ وی ب خوە ژی، زۆری ل خـەلکی بێتە کرن، کەسێ ماف نینە ب کۆتەکی ئیرادە و ڤیانا خوە، ل سەر غەیری خوە بسەپینت.

٤- **گرنگیدان ب خالێن هەڤپشك و خوە نێزیکی هەڤ کرن:**

بێ گومان، هەردەم کۆمەکا خالێن هەڤپشك هەنە د ناڤبەرا وان ئالییاندا، ئەوێن دان و ستاندنێ دکەن. لەو بەرئاقل نینە، کو جودایی هند مەزن ببن، ببنە ئەگەرێن هندێ، گەلەك نەلێکی و ئاڕێشە ژێ پەیدا ببن، و نەشێن پێکڤە بژین. ل دۆر گیانێ دان و ستاندنێ و ڕێزگرتنا بیر و بۆچوونێن بەرانبەران، ئیمامێ شافعی دبێژت: ((بیر و بۆچوونا من ڕاستە و تێ هەیە خەلەت بت ژی، و بیر و بۆچوونا یێ نە د گەل من خەلەتە، لێ دوور نینە ڕاست ژی بت)) و ئیمامێ مالك ژی دبێژت: ((**جوداییێ قوتبڕ نەکە، و د کیسێ خەلکیدا بهێلە**)) ئانکو: ژ خەلکی ڤەبن، بلا جوداییێن وان د کیسێ واندا بمینن، و پێکۆلا قوتبڕکرنا وان جوداییان نەکەن. دیرۆکا ئیسلامێ گەلەك بەرپەڕێن زێڕین و هەلوێستێن ب ڕوومەت تێدانە، پشتەڤانییا ڕێزگرتنا جوداییێ دکەن.

گەنگەشەکەرێ سەرکەفتی، ئەوە یێ ژ خالێن هەڤپشك دەست ب دان و ستاندنێ دکەت، و ژ ڕێڤە جوداییا هلنـەئێخت و نەکەتـە ئاسـتەنگ، دا دۆزا گەهشـتنا چارەسـەرییەکا هەڤپشـك و کێمکرنـا پاناڤـا جـودایی و نەلێکییێ، ببتە ئارمانجا هەردو ئالییان یـان هـەمی ئـالییێن هەڤپشـك د دان و سـتاندنێدا. هـەر وەکـی پێشـتر هاتییە گۆتن، قورئانا پیرۆز، گازی دووکەڤتییێن ئایینێن دی دکەت، دا ل سەر کۆمەکا خالێن هەڤپشك، ئەوێن هەمی ئایینێن ئەسمانی تێدا هەڤپشك، بئێورن و ببنە ئێك.

٥- **باش گوهداریکرن:**

گەنگەشەکەرێ سەرکەفتی، دڤێت گوهدارەکی سەرکەفتی ژی بت، چـونکی ب ڕێکـا جـوان گوهـداریکرنێ، دشێت باش د مەرەما یێ بەرانبەر بگەهت و بزانت کا چاوا هزر دکەت، هەر وەسا دڤێت ئاخڤتنا وی ژی نەبڕت و ب ڤێ چەندێ، دێ د چاڤێ یێ بەرانبەردا، مەزنتر و ب قەدرتر لێ ئێت، و دێ ڕێکا وی بـۆ تفـاق و پێکهـاتنێ پتر خوەش کەت.

٦- **دەستپێکرن ژ یێ گرنگتر بت:**

گەنگەشەکەرێ سەرکەفتی، ژ تشتێن گرنگ دەست ب دان و سـتاندنێ دکـەت، و دەمـێ خـوە و یـێ غـەیری خوە ل سەر حسێبا بابەتێن گرنگ، ب تشتێ بێ مفاڤە پووچ ناکەت، بۆ نموونە پێغەمبـەرێن خـودێ (سـلاڤ ل هەمییان بن) دەمێ بانگ و گازی بۆ مللەتێن خوە هلددێران، دا ڕێکا دینێ خودێ بگرن، ژ باوەرییێنانێ دەست پێ دکرن، چونکی ئەو بنستر و بناخەیا هەمی مەسەلە و دۆزێن دیتر بوو، خـودایێ مـەزن دبێـژت: (( **... اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ ...** )) (**الأعراف ٥٩**) ئانکو: خودێ بپەرێسن، هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودایێن دی یـێن هێژایی گوهداری و پەرستنێ نینن.

٧- ڕێزگرتنا ڕاستییێ:

مرۆڤ دەمێ دان و ستاندنێ، نەمازە دان و ستاندنا هزری، دڤێت قەدرێ ڕاستییێ بگرت، ئەگەر خوە ژ دەڤێ ئالییێ بەرانبەر ژی دەرکەڤت. ئیمامێ شافعی د ئاخفتنەکا خوەدا ل دۆر ڤێ چەندێ، دبێژت: ((هەر دەمەکێ من گەنگەشە ل دۆر دۆز و مەسەلەیەکا زانستی، د گەل غەیری خوە کربت، من ژ خودێ خوازتییە کو هەڤی ل سەر زمانێ وی بێتە گۆتن)) ئەڤە ژی هندێ دیار دکەت، کو گەنگەشەکەرێ ڕاست و دورست، شکاندنا یێ بەرانبەر بۆ خوە ناکەتە ئارمانج، بەلکو مەرەما وی، گەهشتنا ڕاستییێ و ڕێزگرتنا وێیە.

٨- دوورکەڤتن ژ جیناڤێن (من/ ئەز) و (ئەم/ مە):

هندی مرۆڤ بشێت، دڤێت د دەمێ دان و ستاندنێدا، خوە گەلەك ژ کارئینانا جیناڤێ (من/ ئەز) و (ئەم/ مە) بپارێزت، و خوە ژ وان بدەتە پاش، چونکی ئاستەنگان د ناڤبەرا مرۆڤی و ئالییێ دیدا چێ دکەن، و یێ بەرانبەر وەسا تێ دگەهینت، کو مرۆڤ بەس بیر و بۆچوونا خوە ڕاست دبینت، و چو پووتە و گرنگییێ نادەتە بیر و بۆچوونا غەیری خوە، و مرۆڤ پێکۆل و بزاڤێ دکەت، کو خوە ل سەر غەیری خوە بسەپینت. خودایێ مەزن د وارێ بەرچاڤکرنا ڤێ ئێکێدا، هەردەم دئینتە بیرا مە، کو خوە پێغەمبەرێن وی ژی، وەکی مە هەمییان مرۆڤن، ئەو کەرەما خودێ د گەل وان کری، و پێ ژ غەیری وان جوداکرین، ب تنێ ئەو پەیامە، ئەوا ژ بەرێ خودێڤە بۆ وان هاتییە ڕەوانەکرن، و نابت ژ بەر ڤێ چەندێ، پێغەمبەر ژی، خوە ب سەر غەیری خوە بێخن، و ب چاڤەکی سڤك بەرێ خوە بدەنە وان، یان بیر و باوەر و بۆچوونێن خوە ب کۆتەکی ل سەر وان بسەپینن.

## پسیار:

١- بۆ چ پێدڤییە ئەم بەرێ خوە بدەینە دان و ستاندنێ و بکەینە ڕێبازا سروشتییا چارەسەرکرنا نەلێکی و ئارێشەیان؟

٢- باوەریئینانا کەسەکێ ب دان و ستاندنێ، چ کارلێکرنێ ل سەر ڕێبازا هزرکرن و ڕەفتارێ وی دکەت؟

## دان و ستاندن:

ئەرێ باوەریئینان ب دان و ستاندنێ د گەل بەرانبەران، ڕامانا بەرگری ژ خوە نەکرنێ ددەت، دەمێ وەلات و مللەت تووشی ئێریشێ دبن؟

## وانەیا هەژدەیێ

## هندەك بۆچوونێن دژی بنەمایێن دان و ستاندنێ

هەر وەكی پێشتر مە گۆتی، هەر چەندە دان و ستاندن بهایەكی ئیسلامی و شارستانییە، و ئەو ڕێكا سەركەفتنا مللەتێن موسلمان و هەمی مللەتێن دی یێن جیهانێیە، بەر ب كێلك و گوپیتكا شارستانی و پێشكەفتنێ، بەلێ ژ بەر خراب تێگەهشتنا ئیسلامێ و هندەك دەقێن قورئانێ و فەرمۆدەیان، و ژ بەر هندەك گرفتاری و ئارێشەیێن سیاسی و ئابۆری و جڤاكی و ڕەوشەنبیری و هزری، گەلەك بیر و بۆچوونێن غەریب ژ گیانێ ئیسلامێ و بنەمایێن دان و ستاندنێ، د ناڤ پشكەكا موسلماناندا بەلاڤبوون، زیانەكا گەلەك مەزن گەهاندنە ئیسلامێ و موسلمانان و جڤاكێن وان، و ئەڤ بیر و بۆچوونە ژی، د بیر و باوەرا كافركرنا خەلكی و توندڕەوی و ڤاڕێبوونێدا بەرچاڤ دبت، و ئەم ژی ل خوارێ و ب كورتی دێ ل سەر وان ئاخڤین:

**ئێك - گاوركرن ( كافركرن ):**

**كافركرنا** موسلمانان، ئێكە ژ مەسەلەیێن گەلەك ب ترس و هزركرنەكا ژ ڤی تەرزی، ژ بلی كو د گەل بنەمایێن دینێ پیرۆزێ ئیسلامێ ناگونجت، دژی گیانێ دان و ستاندنێ ب خوەیە ژی.

**ڕامانا كافركرنێ:**

كافركرن ئانكو بالڤەلێدانا پەسنا (كافر) ب بال موسلمانەكێڤە كو شادەیی ب هەڤاندنا خودێ دابت، ل سەر بناخە و بنیاتا بیر و باوەرەكێ یان ئاخڤتن و كریارەكێ كو ژێ هاتبتە دیتن یان بهیستن.

**حوكمێ كافركرنا موسلمانان د ئیسلامێدا :**

هەر وەكی مە گۆتی، ئیسلام هزرا كافركرنا موسلمانان قەبوول ناكەت و ئەڤ قەبوولنەكرنە د گەلەك ئایەت و فەرمۆدەیێن پیرۆزدا هاتییە، ژ وان:

١- خودایێ مەزن دبێژت: (( **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ...** )) (النساء ٩٤) ئانكو: گەلی باوەرداران، دەمێ هوون د ڕێكا خودێدا دچنە جیهادێ، تشتان ژێك ڤاڤێرن و د سەرەدەریكرنا خوەدا چاڤڤەكری بن، گاڤا ئێكێ د مەیدانا شەڕیدا سلاڤی هەوە كر (بەرهەڤییا خوە بۆ پێكهاتنێ دیاركر)، ب هندێ گونەهكار نەكەن، كو ئەو ژ ترساندا وە دكەت و نە یێ ڕاستگۆ و باوەردارە. ئەرێ ما چاڤێ هەوە ل مال و دەستكەفتییێن دنیاییێیە، یان هوون ل خوەشی و بەختەوەرییا خەلكی دگەڕن؟

د ڤێ ئایەتێدا، خودایێ مەزن بەرێ باوەرداران ددەتە هندێ، كو هەر كەسێ خوە ژ موسلمانان دانا و موسلمانبوونا خوە ئاشكەراكر، ب كوفرێ كافر و گونەهكار نەكەن.

٢- پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەكا پیرۆزدا و ب مەرەما دانەپاشا باوەرداران ژ گونەها كافركرنا موسلمانان، دبێژت: (( **مَن رَمى مؤمناً بِكُفرٍ فهُوَ كَقَتْلِه** )) ئانكو: هەر كەسێ گونەها كوفرێ ب بال موسلمانەكێڤە

لێ بدەت، هەچکو ئەو کوژتی، و ئەڤە ژی بەلگە و نیشانەکا ئاشکەرایە کو کافرکرنا موسلمانان، گونەهکارییەکا زێدە مەزنە.

ژ کنارێ گرتنا ڕێبازا ئیسلامێ و پێگیری ب فەرمان و شیرەتێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)، هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) خوە ژ کافرکرنا موسلمانان و هەر کەسێ کەعبە ب قیبلەیا خوە ددیت، دوور دئێخستن. ژ (ئەبوو سوفیان) هاتییە ڤەگوهازتن کو گۆتییە: من گۆتە (جابرێ کوڕێ عەبدوللا)یی: ئەرێ هەوە جارەکێ گۆتییە کەسەك ژ وان ئەوێن بەرێ خوە ددەنە قیبلەیێ و موسلمانن، کافر؟ گۆت: نەخێر، من گۆتێ ئەرێ هەوە گۆتییە وان: هەڤپشکچێکەر (موشرك)؟ گۆت: ئەز خوە ب خودێ ژێ دپارێزم.

## ترس و خرابیێن کافرکرنێ

کافرکرنێ گەلەك کارلێکرن و شوونوارێن خراب هەنە، ژ بەر هندێ ئیسلامێ ڕێ لێ گرتییە و قەدەغە کرییە، ژ وان کارلێکرن و شوونواران ژی:

١– پارچەپارچەکرنا جڤاکا موسلمان، ب ڕێکا هلێخستنا فتنەیێ و بەلاڤکرنا کەرب و کینێ، کو هندەك جاران بگەهتە ڕادەیا کوشتن و تیرۆر و خوونرێتنێ ژی، هەر چەندە ئیسلام بەرێ مە ژ ڤان هەمییان وەردگێڕت و داخوازا قەنجی و ڤیانێ ژ مە دکەت.

٢– لاوازکرن و بەرتەنگکرنا پاناڤا ئازادییا هزرکرن و بیر و ڕایان، نەمازە بۆ زانا و هزرمەندان، ژ ترسا هندێ کو گونەها کافرکرنێ ب بال وانڤە بێتە لێدان، ئەڤە ژی دبتە ئەگەرێ هندێ، کو هندەك کەسێن نەزان و کێم شارەزا د ئیسلامێدا، داکەڤنە مەیدانا فتوەدان و گومڕاکرنا خەلکی.

### پسیار:

بۆ چ کافرکرنا موسلمانان د ئیسلامێدا هاتییە قەدەغە کرن؟

### دان و ستاندن:

چاوا دێ ب بەلگە و نیشان دیار کەی کو کافرکرنا موسلمانان د گەل بنەمایێن ئیسلامێ ناگونجت؟

## وانەیا نۆزدەیێ

# جوهییاتی ( ئایینێ جوهییان )

جوهییاتی وەك ئایین، ژ ئالییێ دیرۆکیڤە، ئایینێ دووندەها **(بەنی ئیسرائیل)**بوو، کو ئێکە ژ سێ ئایینێن مەزنێن ئەسمانی.

**دووندەها ئیسرائیل :** دووندەها ئیسرائیل دگەهنە ئیبراهیم پێغەمبەر (سلاف لێ بن)، دەمێ کورەك ب دوو کەڤتی و ناڤێ وی کرییە (ئیسحاق) و کورەك ب دوو ئیسحاق کەڤتی و ناڤێ وی کرییە (یەعقووب)، بەلێ یەعقووب ناڤەکی دی ژی هەبوو، کو ئەو ژی (ئیسرائیل) بوو، ژ بەر هندێ ناڤێ (بەنی ئیسرائیل) یان (ئیسرائیلی) ل دووندەها وی هاتییە کرن، گەلەك پێڤە نەچوو هەژمارا وان گەلەك بۆش بوون، و د بزاڤ و پێکۆلا خودا بۆ دیتنا چەرە (چەروان) و ئاڤەکا باشتر، قەستا مسرێ کرن و ل وێرێ خوەجە بوون.

کنیشتەکا جوهییان

مسری وی دەمی بتپەرست بوون و گەلەك جوونێن خوداوەندان دپەرستن، ترسا بۆشبوونا هەژمارا عیبرییان و جوداییا بیر و باوەر و ئایینا وان کەڤتە دلێ وان، فیرعەونێ دەستهلاتدارێ مسرێ، رۆژەکێ پیر و پێشی و کاهنێن ئایینی کۆم کرن، ئینا وان ژ بۆ نەهێلانا ترسا ژێگۆتی، پێشنیارکر، کو ئەو عیبرییان بکەتە کۆلە، دا وەکی مسرییان لێ بێن و بێنە سەر دینێ وان، و فیرعەون ژی د گاڤێدا داخوازا وان پەسەند کر. ب ڤی ئاوایی عیبرییان ژی پچپچە خوە ژ بیر و باوەرێن ئێکتاپەرێسییێ کو ژ ئیبراهیم وەرگرتبوون دانە پاش، و

گەلەك جوون و ڕەنگێن گەلەك خودایی و بتپەرستییێ د ناڤ هلکرن، بەلێ د سەر هندێڕا ژی، گەلەك تێکلی مسرییان نەدبوون و بەردەوام هەژمارا وان زێدە دبوو، ژ بەر هندێ و ل دووڤ شیرەتا پیر و پێشییێن ئایینی، بڕیار دا، کو هەر کوڕەکی ژ عیبرییان ب سەر دنیایێ بکەڤت و ببت، بێتە کوشتن و تەلافتن، و کچێن وان ژی شوو ب مسرییان بکەن و ب ڤی ئاوایی د ناڤ مسرییاندا بێنە حەلاندن و قوتبڕ ببن.

## بوونا مووسا پێغەمبەر ( سلاڤ لێ بن )

د ڤی دەمیدا، مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ب سەر دنیایێ کەڤت، دەیکا وی شیا سێ هەیڤان ل سەر ئێك ژ چاڤێن زەلامێن فیرعەون بڤەشێرت، و پاشتر خودایێ مەزن سرووش ئێخستە دلێ وێ، کو کوڕێ خوە بکەتە د سندۆقەکێدا و د بەر ڕۆبارێ نیلدا بەردەت و ژێ بگەڕت و بهێلتە ب هیڤیا خودێڤە: (( **إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى ﴿٣٨﴾ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ ... ﴿٣٩﴾** )) (طه ٣٨ - ٣٩).

مووسا پێغەمبەرێ خودێ، ڕزگارکەرێ بەنی ئیسرائیل، خودێ نێزیکی کۆچك و سەرایا فیرعەون، ستێرا وی گەشکر. هەڤسەرا فیرعەون ئەو دیت و ئێکسەر کەڤتە د دلێ وێدا و شیا مێرێ خوە قایل بکەت کو وی نەکوژت، و ژ خودێ خوازت کوع یبری نەبت و مەزن بکەت و ببتە بیناهییا چاڤێن وێ، ب ڤی ئاوایی، ژیانا مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دەست پێ کر، و د کۆچکا فیرعەون ب خوەدا مەزن بوو، ڕۆژەکێ مووسایی ئێك ژ وان مسرییان دیت، ئەوێن بۆ زێرەڤانییا کۆلەیێن عیبری هاتییە تەرخان کرن، گەلەك ب دلڕەقی دو کۆلەیێن عیبری دقوتان، وی ژی نەشیا خوە، یێ مسری قوتا و یێ مسری ژی ژ بەر وێ قوتانێ دمرت، و پاشتر، پشتی ئەڤ کریارە ئاشکەرا دبت، مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) نەچار دبت، ژ وێ دەڤەرێ دەردکەڤت و مسرێ ب پشت خوەڤە دهێلت، وەختەکێ دگەهتە بیبانا مەدیەن نێزیکی کەنداڤێ عەقەبە، ل وێرێ (٨) سالان، ل مالا شوعەیب پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ما، و کچەکا وی مارکر و بوو هەڤسەرا وی، و د شەڤەکا سار و ب سڕ و قڕ، مووسا (سلاڤ لێ بن) ژ بەرێ خودایێ پەروەردگارڤە هاتە ئاگەهدارکرن، کو ئەو وەك پێغەمبەر هاتە هلبژارتن، و بۆ پشتڕاستکرنا وی ژی هەر وێ شەڤێ چەند موعجیزەیەك نیشا دان.

خودایێ مەزن فەرمان دایێ کو بچتە دەڤ فیرعەون و گازی و بانگی بۆ بیر و باوەرێن ئێکتاپەرێسییێ هلدێرت، وی ژی داخوازکر کو (هاروون)ێ برایێ وی بدەتە د گەل، دا پشتەڤانییا وی بکەت، مووسا چوو دەڤ فیرعەون و داخوازا ڕزگارکرنا مللەتێ خوە کر ژ کۆلەتییێ، هەر وەسا داخواز ژێ کر کو ئازاد ببن د پەرستنا خودایێ خوەدا، ئینا فیرعەون گۆتێ: خودایێ تە کییە؟ (( **قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى** )) (طه ٤٩)، وی ژی بەرسڤا و یدا و گۆت: خودایێ هەمی جیهانانە، (( **وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ** )) (الأعراف ١٠٤)، وی ژی لێ ڤەگێڕا و گۆت: من چو خوداوەند ب ڤی ناڤی نەبهیستینە، و ئەز خوداوەندێ هەمی خوداوەندانم، ژ بەر هندێ ئەز ڕێکێ نادەمە (بەنی ئیسرائیل) کو بچن یان ئازاد ببن و دڤێت وەك کۆلە هەر د خزمەتا من و مللەتێ مندا بمینن.

مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) موعجیزەیێن خوە نیشا وان دان، بەلێ هەر فیرعەون باوەری نەئینا، و پتر ئیزا و نەخوەشی گەهاندە ئیسرائیلییان، مووسایی فیرعەون ئاگەهداری سەرئەنجامێ خرابییا کار و کریارێن وی و تۆلەیا پەروەردگاری کر، بەلێ هەر بێ مفا بوو، بەلێ پشتی گەلەك موعجیزە و گوهۆڕینکارییان، دووماهییێ فیرعەون ڕازی بوو ڕێکێ بدەتە بەنی ئیسرائیلییان کو دەربکەڤن، دەمێ بارکرین، خەبەر گەهشتە فیرعەون کو وان گەلەك زێڕ و خشرێن مسرییان د گەل خوە برینە. ئینا فیرعەون ب لەشکەرێ خوەڤە کەڤتە دوو وان و ل بەر لێڤا دەریایا سۆر گەهشتە وان، ل وێرێ خودێ د هەوارا بەنی ئیسرائیلییان هات و دەریا بۆ وان کرە هشکاتی، و مووسا ب مللەتێ خوەڤە دەربازبوون، و فیرعەون ب لەشکەرێ خوەڤە خەندقین. کەلەخێ مۆمیاکرییێ وی فیرعەونێ خەندقی، هەتا نها ژی د مۆزەخانەیێدا هاتییە پارزتن.

## هەر دەه شیرەتێن مووسا پێغەمبەر ( ل دووڤ گۆتنا تەوراتێ )

مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) بەری بمرت، دەه شیرەت ڕابەری جوهییان کرن، دا ببنە ڕێبازا ژیانا وان، کو ئەو ژی ژ ڤان خالێن خوارێ پێکهاتبوون:

١- ژ بلی خودایێ (یەهوا) چو خوداوەندێن دی نەپەرێسن.

٢- چو بت و پەیکەران نەپەرێسن.

٣- ناڤێ (یەهوا) نەکەنە جهێ پێیاریکرنێ، (ب ناڤێ یەهوایێ پەروەردگار کرێت نەئاخڤە).

٤- ڕۆژا حەفتێ ژ هەر حەفتییەکێ -کو شەنبییە - بێنا خوە ڤەدەن و ب ڕۆژەکا پیرۆز ببینن، و بکەنە ڕۆژا پەرستنا خودێ.

٥- قەدرێ دەیك و بابێن خوە بگرن.

٦- خەلکی نەکوژن.

٧- خوە ژ ڕێك و ڕێبازا ڕاستانی نەدەنە پاش (زنایێ نەکەن).

٨- دزییێ نەکەن.

٩- ژ درەو سووند نەخون، و شەهدەکییا ژ درەو نەدەن.

١٠- د گەل خەلکی زکرەش نەبن، و خوەزییان بۆ مالێ وان ژی نەخوازن.

## کتێبا پیرۆزا جوهییان

(تەورات) کتێبا پیرۆزا جوهییانە، کو ل دووڤ باوەرا مە موسلمانان، د بنیاتدا پەیاما خودێیە و بۆ مووسا پێغەمبەر ژ ئەسمانی هاتییە هنارتن.

بەلێ پیر و پێشییێن دینێ جوهییان، کتێبا خوە یا پیرۆز ب ڤی ئاوایی پشککرینە:

**پەیمانا کەڤن ( العهد القدیم )** : کو ل دەڤ جوهی و فەلەیان (مەسیحییان) پیرۆزە و پێکهاتییە ژ کۆمەکا شعر و پەخشان و پەند و چیرۆك و ئەفسانە و فەلسەفە و تەشریع و پێگۆتنێ، و ئەڤە ژی ل سەر دو پشکان دئێتە پشککرن:

١- **تەورات:** كو ژ (٥) سفران پێكهاتييە: چێكرن (التكوين)، دەركەڤتن (الخروج)، (لاوين)، بەحس و خەبەر (الاخبار)، هەژمار (العدد)، ستايشكرن (التثنية) كو دبێژنە ڤان سفرێن مووسايى.

بەلێ تشتێ جهێ سەرنجڕاكێشانێ ئەوە كو تەوراتا بۆ مووسا پێغەمبەر هاتييە ڕەوانەكرن، دەمێ وێرانكرنا پەيكەرى، سەردەمێ ئێرێشا پاشايێ بابلى (بەختى نەسر)دا نەما و هندا بوو، و پاشتر سەر ژ نوو هاتە نڤيسين، و ب هندێ ژى وەكى بەرێ نەما و گەلەك تشتێن دى د ناڤ هاتنە هلكرن.

٢- **سفرێن پێغەمبەران:** كو دو جوونن:

ئـ- سفرێن پێغەمبەرێن پێشين: يەشووع، يووشەعێ كوڕێ نوون، قازييان، مووتێلێ ئێكێ، سامۆئێلێ دويێ، پاشايێن ئێكێ، پاشايێن دويێ.

ب- سفرێن پێغەمبەرێن پاشين: ئەشقيا، ئرميا، حەزقيال، هووشەع، يووئيل، عامووس، عوبدييا، يوونس، ميخا، تاحووم، حەبەقەوق، سەفەنيا، حەجى، زەكرييا، مەلاخى.

**هندەك كتێبێن دى ژى هەنە، كو پێكهاتينە ژ:**

١- نڤيسارێن مەزن: مەزامير، زەبوور، پەند، پەندێن سولەيمان، ئەييووب.

٢- هەر پێنج بەرگ: (نشيد الانشاد)، راعوون، پێگۆتن، پێگۆتنێن ئرميا (الجامعه)، (ئستير).

٣- كتێب: عەزرا، نەحەميا، بەحس و خەبەرێن ڕۆژگاران/يا ئێكێ (اخبار الايام/الاول)، بەحس و خەبەرێن ڕۆژگاران/يا دويێ (اخبار الايام/الثاني).

وێنەيێ ديوارێ مەبكا (المبكى) ژ جهێن پيرۆزێن ئاينێ جوهييانە

## هندەك بير و باوەرێن دى يێن جوهييان

١– ل دەڤ وان وەیە کو ئەو زارۆکێ خودێ داخوازا سەرژێکرنا وی ژ ئیبراهیم پێغەمبەر کری (سلاڤ لێ بن)، ئیسحاقێ کورێ سارایێیە نە ئیسماعیلە.

٢– چو تشتێ وەسا بەرچاڤ ل دۆر ساخبوونا پشتی مرنێ و ڕۆژا قیامەتێ و خەلات و جزایێ وێ ڕۆژێ، د دینێ واندا نەهاتییە، ژ بلی وان ئیشارەتێن کێم، ئەوێن د بن کارلێکرنا دینێ زەردەشتییاندا هاتینە وەرگرتن.

٣– خەلات و جزاکرن ل سەر دنیایێ دێ ئێنە ئەنجامدان، خەلات پشتەڤانی و سەرکەڤتنە، و جزاکرن ژی خوسارەتی و سەرشۆڕی و کۆلەبوونە.

٤– پێدڤییە هەر جوهییەك، د سالێدا سێ جاران بچتە حەجا قودسێ، د جەژنێن (فەسح) و (حەفتییان) و (کەپرەشینان)دا، ئێك ژ ڕێ و نیشانێن حەجا وان ژی پێشکێشکرنا قوربانەکی براشتییە بۆ پەیکەر (الهیکل)ی.

٥– تابووت: ئەو سندۆقە ئەوا بهاترین سامان و بەلگەنامە و کتێب تێدا دئێنە پارزتن.

٦– کوشتارگەهـ (المذبح): جهەکی تایبەتە بۆ سۆتنا بخوورێ، بەرانبەری وێ پەردەیا ل بەر تابووتێ.

٧– پەیکەر (الهیکل): ئەو ئاڤاهییە ئەوێ (داود) پێغەمبەر فەرمان ب ئاڤاکرنا وی دایی و سولەیمان ئاڤاکری، و ژ ناڤدا میحرابەك چێکر ب ناڤێ (پیرۆزێ پیرۆزان = قدس الاقداس) هاتە ناڤکرن، هەر وەسا جهەکی تایبەت تێدا بەرهەڤکر بۆ دانانا تابووتا پەیمانا پەروەردگاری.

٨– کەهانە (کهانة): تایبەتە ب کوڕێن (لیفی)ڤە (ئێك ژ کوڕێن یەعقووبە)، کو تنێ وان مافێ شرۆڤەکرن و ڕاڤەکرنا دەقێن پیرۆز و پێشکێشکرنا قوربانان هەیە، و دانا باجان ژ وان ناگرت، و کەسینییا وان، ڕێك و ئامرازەکە بۆ نێزیکبوونێ ژ خودێ، ب ڤی ئاوایی ژی، وە لێ هاتن کو ژ ئێکا هێزێڤە ب سەر پاشایان بکەڤن.

٩– قوربان (القرابین): قوربانێن مرۆڤان د گەل یێن گیانەوەر و بەر و بەرهەمێن شینکاتی و داروباران، و پاشتر خودێ ب پارچە و پشکەکێ ژ لەشێ مرۆڤی قایل بوو، ئەو ژی ئەو پارچەگۆشتە ئەوا دەمێ سونەتکرنێ ژ لەشێ مرۆڤی دئێتە ڤەکرن، و جوهی هەتا ئەڤرۆ د گەل گیانەوەر و بەر و بەرهەمان، پێگیرییەکا دورست پێ دکەن.

١٠– هزر و باوەرا کراسگوهۆڕینێ (دۆناندۆن) ژی کو د تەلموودێدا هەیە، ژ هندۆکان هاتییە وەرگرتن و هندەك جوهییان کرییە د ناڤ دینێ خوەدا، و حاخامێن بابل ئەو ژی کرییە د ناڤ بیر و باوەراندا.

١١– دینێ وان، دینەکی دائێخستی و گرتییە، و نابت کەسەکی د بنیاتا خوەدا جوهی نەبت، ببتە جوهی.

١٢– کوڕێ نەخری، میراخوەرێ ئێکێیە، و بارا وی تەمەت یا دو برایێن وییە. د میراتیدا ژی، جودایی د ناڤبەرا زارۆکێ شەرعی و یێ نەشەرعیدا نینە.

١٣- پشتی ژنئینانێ، ژن دبته پشكەك ژ ملك و مالێ زەلامێ خوە، و مالێ وێ ژی دبته مالێ زەلامـی، لـێ ژ بەر گەلەك ئارێشە و گرفتارییان د ڤی واریدا، نەچاربوون بهەقینن كو مالێ ژنێ، ملك و مـالێ وێ ب خوەیە، بەلێ مفا و بەر و بەرهەمێ ژێ دئێت، دێ بۆ زەلامێ وێ بت.

١٤- هـەر كەسـێ ژییـێ وی بگەهتـە (٢٠) سـالییێ و ژن نـەئینابت، هێـژایی لەعنـەتا خودێیـە، و رێـك بـۆ گەلـەژنییێ ژی ب ئاوایـەكی سـەربەردایی هاتییـە دان، رەبانییـان پاشـتر كرینـە چـار ژن، بـەلێ (قەرائوون)ان هەژمارا وان سەربەردایی هێلایییە و چو سینۆر بۆ ڤەنەبرینە.

**پسیار:**

ل دووڤ وی تشتێ تـە د ڤـێ وانەیێـدا خوانـدی، تـو بێـژی دینـێ جوهییـان ئـەوێ سـەردەمێ مووسـا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)، وەكی یێ ڤی سەردەمی بت؟

# ناڤەرۆك